




## دوو نامەی پوخت و بە سوود لەبارەی

# یەکتاپەرستی و بەندایەتی

## لەبەر ڕۆشنایی قورئان و فەرموودە صەحیحەکان

**تەخریجی فەرموودەکان لەسەر پەرتوکەکانی**
**زانای پایەبەرز شێخ محمد بن ناصر الدین الالبانی کراوە**
**ڕەحمەتی خوای لێبێت**


**دانانی**

**شێخ ئەبو محمد المقدسي**

**وەرگێڕان و ئامادەکردنی**

**ئیمام عبد الله**





دوو نامەی پوخت و بە سوود لەبارەی

# یەکتاپەرستی و بەندایەتی

## ( التَوحيد وَالعِبادَة )

لەبەر ڕۆشنایی قورئان و فەرموودە صەحیحەکان


دانانی:

شێخ ئەبو محمد المقدسی

وەرگێڕان و ئامادە کردنی:

ئیمام عبداللّه


تەخریجی فەرموودەکانی لەسەر

پەرتوکەکانی زانای پایە بەرز شێخ محمد بن ناصر الدین الالبانی کراوە ڕەحمەتی خوای لێ بێت

# نامەی یەکەم

# یەکتاپەرستی خوا

## تَوحيدُ اللّٰه

حَقُ اللهِ عَلى العِباد ( العُروَةُ الوُثقى )

مافی خوایە بەسەر بەندەکانەوە ( کۆڵەکەی دامەزراو )

بسم الله الرحمن الرحيم

الحمد لله رب العالمين، والصلاة والسلام على سيدنا محمد قائد الغر المحجلين، وعلى آله وأصحابه الذين حملوا راية الجهاد في ربوع العالمين، وعلى قادة الحق، ودعاة الخير بإحسان إلى يوم الدين.

وبعد:

بزانە: خوای گەورە لە ئێمە و تۆش خۆش بێت، یەکەم شتێك کە خوای گەورە فەڕزی کردووە لەسەر بەندەکانی، کە بیزانن و فێری بن و کاری پێ بکەن، پێش نوێژ کردن و بەڕۆژو بوون و حەج کردن و تەواوی فەڕائیزەکانی دیکەی ئیسلام، بریتیە لە یەکتاپەرستی (تەوحید) خوای گەورە، بەڵێ یەکتاپەرستی خوای گەورە، چونکە خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿ فَاعْلَمْ أَنَّهُ لَا إِلَهَ إِلَّا اللَّهُ ﴾ محمد١٩) واتە: بزانە و فێربە کە هیچ خوایەك نییە بەهەق شیاوی پەرستن و بەندایەتی بۆ کردن بێت، تەنها زاتی پیرۆزی (الله) نەبێت)).

وە خوای گەورە هەموو مرۆڤەکانی تەنهاو تەنها لە پێناوی بەدیهێنان و جێبەجێ کردنی ئەم مەبەستە گەورە و عەظیمە بەدی هێناوە، بەو بەڵگەی لە سورەتی (الذاريات) دا دەفەرموێت: ﴿ وَمَا خَلَقْتُ الْجِنَّ وَالْإِنْسَ إِلَّا لِيَعْبُدُونِ ﴾ ٥٦) واتە : من جن و مرۆڤەکانم تەنها لەبەر بەندایەتی خۆم بەدی هێناوە/ یان من جن و مرۆڤەکانم دروست نەکردووە بۆ ئەوە نەبێت کە تەنها من بپەرستن و بەندایەتی بۆ من بکەن)).

زانایانی تەفسیر دەفەرموون: أي ليوحدون، (يعبدونني وحدي)، واتە بۆ ئەوەی یەکتاپەرست بن، بەتەنها بەندایەتی و عیبادەت بۆ من بکەن، وە هەر ئەوەشە واتا و مانای (لاإله إلا الله)، واتای ئەوەیە هیچ پەرستراوێك نییە بەهەق تەنها زاتی پیرۆزی (الله) نەبێت .

وە ئەمە، ئەو مەبەست و ئامانجەیە کە لە پێناویدا تەواوی پێغەمبەرانی بۆ نێردراوە، وە خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿ وَلَقَدْ بَعَثْنَا فِي كُلِّ أُمَّةٍ رَسُولًا أَنِ اعْبُدُوا اللَّهَ وَاجْتَنِبُوا الطاغوت ﴾ النحل ٣٦) واتە ئێمە بۆ هەموو گەل و نەتەوەیەك (قەومێك)

**پێغەمبەرێكمان ڕەوانە كردووە، هەتا بەندایەتی خوای گەورە بكەن و واز لە بەندایەتی و گوێڕایەڵی (طاغوت)[1] بهێنن )).**

---

١ ) ماناو واتای (طاغوت) بەم جۆرەیە : (( یشمل كل معبود عُبِدَ مِن دون الله تعالى بأي نوع من أنواع العبادة وهو غير منكر لذلك )). واتە: هەموو پەرستراوێك دەگرێتەوە كە لە جێگەی خوای گەورە بپەرسترێت ، بەهەر جۆرێك لە جۆرەكانی بەندایەتی بۆ كردن بێت، ئەویش ڕازی بێت پێی و هیچ نكوڵی پەرستنی نەكات )). بەم جۆرە پێناسەی دەكرێت.

هاوەڵی موفەسیر (موجاهید) خوای لێ ڕازی بێت دەفەرموێت:

(( **الطاغوت**: الشيطان في صورة الأنسان يتحاكمون إليه وهو صاحب أمرهِم)). واتە طاغوت: شەیتانە لە وێنە و شێوەی مرۆڤدا، كە مرۆڤەكان دەگەڕێنەوە بۆلای حوكم و بریاری و ئەویش حوكم و فەرمانیان پێدەكات و دەبێتە حاكمیان )).

هەروەها شێخی ئیسلام ئیبن تەیمیە ڕەحمەتی خوای لێ بێت دەفەرموێت:

(( ولهذا سُمِيَ مَن تُوحكِمَ إليه من حاكم بغير كتاب الله: **طاغوت** )).١ واتە: لەبەر ئەمە ئەوانەی حوكم بە كیتابی خوا گەورە (قورئان) ناكەن و حوكم بۆلای ئەوان دەبرێتەوە لە جێگای كیتابی خوای گەورە، پێیان دەوترێت و ناویان لێ دەنرێت: طاغوت )).

وە قوتابی شێخی ئیسلام ئیبن تەیمیە، كە ئیبن قەییمی ئەلجەوزی یە ڕەحمەتی خوای لێ بێت دەفەرموێت: (( **الطاغوت**: كل من تجاوز به العبد حده من معبود أو متبوع أو مطاع، فَطاغوت كل قوم من يتحاكمون إليه غير الله و رسوله، أو يعبدونه من دون الله، أو يتبعونه على غير بصيرة من الله، أو يطيعونه فيما لا يعلمون أنه طاعة لله )).١ واتە: طاغوت: بریتیە لە هەموو ئەو شتانەی كە بەندە سنوریان دەبەزێنێت لە پەرستراوێك یان شوێن كەوتنێك یان گوێڕایەڵی كردنێك، وە طاغوتی هەموو گەل و قەومێك ئەو كەسەیە كە حوكم و بریار دەگەڕێننەوە بۆلای، لە جێگای ئەوەی بی گێڕنەوە بۆلای خوا و پێغەمبەرەكەی، یان ئەوەی لە جێگای خوای گەورە دەیپەرستن و بەندایەتی بۆ دەكەن، یان شوێنی دەكەون كوێرانە و بەبێ هیچ بەصیرەت و چاو ڕونی یەك لە خوای گەورەوە، (واتە: بێ ئەوەی بگەڕێنەوە بۆ لای كیتاب و سوننەت، چونكە بەصیرەت بریتیە لە كیتاب و سوننەت)، وە گوێڕایەڵی و ئیتاعەی دەكەن لە شتانێكدا كە نازانن گوێڕایەڵی و ئیتاعە كردنی بۆ خوای گەورەیە، واتە تەنها ماڤی خوای گەورەیە و دروست نییە بۆ كەسی دیكە بكرێت )).

هەروەها دەفەرموێت: (( من تحاكم أو حاكم إلى غير ما جاء به الرسول صلى الله عليه وسلم فقد حكم الطاغوت أو تحاكم إليه)).١ واتە: جا هەركەسێك حوكمی بردەوە بۆلای كەسێك یان شتێكی كردە حاكم، جگە لەوەی كە پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) هێناوییەتی، ئەوە طاغوتی كردۆتە حاكم و حوكمی بۆلای طاغوت گەراندۆتەوە )).

وە وشەی (طاغوت) لە (الطغیان)ەوە وەرگیراوە، كە ئەویش بریتیە لەوەی دروست كراو یان مرۆڤ ئەو سنور و ئەندازە بشكێنێ وببەزێنێ كە خوای گەورە بۆی داناوە و سنووری كردووە، وە جۆرەكانی بەندایەتی (عیبادەت) زۆرن، یان بەندایەتی چەند جۆرێكە، وەك چۆن سجود و ركوع و دوعاو نەذر و (ذەبح) سەربڕین هەموویان بەندایەتی و عیبادەتن، وە بەهەمان جۆر گوێڕایەڵی و ئیطاعەت لە تەشریعدا بەهەمان جۆر بەندایەتی و عیبادەتە وەك ركوع و سجود...

خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿ أَنِ اعْبُدُوا اللَّهَ وَاجْتَنِبُوا الطاغوت ﴾ ئەمەش مانا و واتای (لاإله إلا الله) یە، چونکە پێك هاتووە لە نەفی و ئیسپات، واتە نکوڵی کردن و بەدرۆ خستنەوە، پاشان باوەڕهێنان و ساغ بوونەوە، ئەویش یەکەمیان بریتیە لە نەفی کردن و بەدرۆ خستنەوەی تەواوی خواکانی دیکە، کە دەڵێین (لا إله) هیچ خوایەك نییە، وە دووهەمیان بریتیە لە باوەڕهێنان و ساغ بوونەوە بە باوەڕ هێنان بە خوای گەورە و تاك و تەنها، کە دەڵێین ( إلا الله) تەنها زاتی پیرۆزی (الله) نەبێت .

واتە دەستەواژەی شەهادەت (لاإله – إلاالله) لە دوو بەشی سەرەکی پێك دێت، کە پێیان دەڵێن (النفي والاثبات) بەدرۆ خستنەوە و ساغ بوونەوە، بەم جۆرە:

- **لاإله:** دوور کەوتنەوە و بێ باوەڕ بوون دەگرێتەوە بە هەموو ئەو شتانەی کە جگە لە خوای گەورە دەپەرسترێن و بەندایەتی یان بۆ دەکرێت، کە پێی دەوترێت (ألنفی)، و ئەویش بریتیە لە (طاغوت) ئەگەر ڕازی بێت بە پەرستنی و بەندایەتی بۆ کردنی.[٢]
- **إلا الله:** پێك دێت لە ئیسپات و ساغ بوونەوە و باوەرهێنان بە بەندایەتی خوای تاك و تەنها، و پێی دەوترێت (ئیسپات).

وە دەبێت بۆ بەجێ گەیاندن و تەحقیقی ئەم وشە گەورە و پیرۆزە، هەردوو بەشی (نەفی) و (ئیسپات) پێکەوە کۆ بکرێنەوە، چونکە (نەفی) بۆخۆی بە تەنها بریتیە لە کوفر و تەعطیل و بەدرۆ خستنەوە، وە (ئیسپات) یش بۆخۆی هەر بەتەنها بەبێ (نەفی) بەس نییە، چونکە باوەر و ئیمان بە تەنها بەبێ نەفی و کافر بوون بە خوا و پەرستراوەکانی دیکە دانامەزرێت، چونکە باوەرهێنان (ئیسپات) بە تەنها پەرستراوەکانی دیکەش دەگرێتەوە، بەڵام لەسەر بنەمای (نەفی) و (ئیسپات) بەندە لە نێوانی هەردووکیاندا کۆدەبێتەوە، ئیتر بەو جۆرە خوای گەورە بە تاك و تەنها دەپەرستێت و تەنها بەندایەتی بۆ ئەو دەکات و کوفر و بەرائەتیش دەکات بە تەواوی پەرستراوەکانی دیکە، وە تەنها بەم جۆرە یەکتاپەرستی (تەوحید) دێتە ئامانج و

---

٢ ) ئەمەش مەرجێکی گرنگە: چونکە دەستەواژەی (طاغوت) ناچەسپێت بەسەر ئەو کەسانەی کە دەپەرسترێن و، ئەوانیش ڕازی نین بە پەرستنیان،وەك فریشتە و پێغەمبەر عوزەیر و عیسا مەسیح و جگە ئەوانیش، لە پێغەمبەران و پیاو چاکان و صالحین، بەمانە ناوترێن طاغوت، وە بەرائەتیان لێ ناکرێت، بەڵام بەرائەت دەکرێت لە پەرستن و بەندایەتی کردنیان و لە بیرو باوەری عیابدەت (ئولوهیەت) یان .

دەچەسپێت، کە هەموو پێغەمبەران پێی هاتوون، بەڵام زۆربەی خەڵکی لێی بێ ئاگان، وا دەزانن تەنها بە جێبەجێ کردنی بەشی دووەم شەهادەکەیان دادەمەزرێت !

خوای گەورە (عزوجل) دەفەرموێت: ﴿ **يُنَزِّلُ الْمَلَائِكَةَ بِالرُّوحِ مِنْ أَمْرِهِ عَلَى مَنْ يَشَاءُ مِنْ عِبَادِهِ أَنْ أَنْذِرُوا أَنَّهُ لَا إِلَهَ إِلَّا أَنَا فَاتَّقُونِ** ﴾ النحل٢). واتە: خوای گەورە جوبرەئیل و ئەوانەی لەگەڵیدان لە فریشتەکانی دیکە، دەنێرێت بە فەرمانی پەیامبەرێتی بۆ سەر (محمد) صلى الله عليه وسلم و تەواوی پێغەمبەرەکانی دیکە، کە خەڵکی لە سزای خوای گەورە بترسێنن و، پێیان بڵێن و ئاگاداریان بکەن کە : هیچ پەرستراوێك نییە بەهەق جگە من، واتە زاتی پیرۆزی (الله) کە بەندایەتی و گوێڕایەڵی بۆ بکەن، کەواتە بە تەنها بەندایەتی بۆ من بکەن و تەنها لەمن بترسن)) .

وە هەروەها خوای گەورە لە سورەتی (ألانبياء) دا دەفەرموێت: ﴿ **وَمَا أَرْسَلْنَا مِنْ قَبْلِكَ مِنْ رَسُولٍ إِلَّا نُوحِي إِلَيْهِ أَنَّهُ لَا إِلَهَ إِلَّا أَنَا فَاعْبُدُونِ** ﴾٢٥). واتە: ئەی (محمد) لە پێش تۆشدا هیچ پێغەمبەرێکمان نەناردووە، تەنها بە مەبەستی ئەوە نەبوبێت کە بە خەڵکی ڕابگەیەنن جگە لە خوای گەورە هیچ کەس و پەرستراوێکی دیکە نییە بە هەق، بۆیە تەنها بەندایەتی و پەرستش بۆ من بکەن و بە تەنها من بپەرستن)).

وە لە سوننەتی پێغەمبەردا (صلى الله عليه وسلم) بە صەحیحی هاتووە کە پێغەمبەری خوا دەفەرمووێت: (( **افضل ما قلته أنا، والنبيون من قبلي : قول لا إله إلا الله وحده لا شريك له**)). [٣] واتە: چاکترین و بەنرخ ترین شتێك کە من و تەواوی پێغەمبەرەکانی دیکەی پێش من کە ووتومانە، وتەی: (هیچ خوایەك نییە بەهەق شیاوی پەرستن و بەندایەتی بۆ کردن بێت جگە خوای تاك و تەنها و بێ شەریك و هاوەڵ نەبێت) بووە )).

هەر لەم پێناوە گەورە و گرنگ و بنەڕەتییەدا، بەر بەرەکانێ و نیزاع لەنێوان پێغەمبەران و گەل و قەومەکانیاندا دروست بووە و سەری هەڵداوە، وە هەر لە پێناویشیدا (الولاء والبراء) وەلائو بەرائەت و (الحب والبغض) خۆشەیستی و ڕق و کینە و (الموالات و المعاداة) دۆستایەتی و دوژمنایەتی دروست بووە، وە هەر لە پێناویشیدا زۆربەی پێغەمبەران ئازار دراون و کوژراون و گیانیان بەخت کردووە، وە

٣ ) صحيح: ئیمامی بوخاری و مالیك و ترمذی و بەیهەقی و طەبەری ریوایەتیان کردووە .

هەر لە پێناویدا هاوەڵ و صەحابییەکان ڕەزای خوایان لێ بێت لە (مەککە) واتە خاکی پێغەمبەری خوا سزا دراون، لە پێش ئەوەی نوێژ و ڕۆژو و حەج و تەواوی فەرائیزەکانی دیکە واجب ببێت، واتە ئێشتا نوێژ و حەج و ڕۆژو و جیهاد و هیچ کارێکی دیکە فەرز نەکرابوون، تەنها یەکتاپەرستی (تەوحید) نەبێت..[٤]، بۆیە خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿ وَعَجِبُوا أَنْ جَاءَهُمْ مُنْذِرٌ مِنْهُمْ وَقَالَ الْكَافِرُونَ هَذَا سَاحِرٌ كَذَّاب أَجَعَلَ الْآلِهَةَ إِلَهًا وَاحِدًا إِنَّ هَذَا لَشَيْءٌ عُجَاب ﴾ ص: ٤-٥). واتە: بێ باوەڕ و موشریکەکانی قوڕەیش (مەککە) زۆریان پێ سەیر بوو، کە خوای گەورە پێغەمبەرێکی ترسێنەری لە نەسەبی خۆیان بۆ ناردوون، ئیتر بێ باوەڕەکان وتیان، بەراستی ئەم کابرایە تەنها درۆزن و ساحیرێك زیاتر نییە و، تەنها چاوبەست و فڕت و فێڵمان لێ دەکات، یەعنی ئێمە واز لە هەموو خواکانمان بهێنین و بەتەنها یەك خوا بپەرستین، بەراستی ئەمە شتێکی سەیرە )).[٥]

وتەی خوای گەورە لە موشریکەکانەوە، لەبارەی دژایەتی و نکوڵی کردنیان بەرانبەر بانگەوازی پێغەمبەر، گەورەیی پەیامی پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) نیشان دەدات، وەك خوای گەورە لەسەر زووبانی ئەوانەوە دەفەرموێت: ﴿أَجَعَلَ الْآلِهَةَ إِلَهًا وَاحِدًا﴾ واتە ئێمە واز لەو هەموو خوایە بهێنین و تەنها یەك خوا بپەرستین؟ ئەمەش تەفسیر و واتای ئایەتی ﴿أَنِ اعْبُدُوا اللَّهَ وَاجْتَنِبُوا الطاغوت﴾ دەگەیەنێت، وە ئەم ئایەتەش تەفسیر و واتای (لاإله إلاالله) یە.

ئەمەیە پەت و کۆڵەکەی مەتین و دامەزراو (العروة الوثقى)، کە خوای گەورە بەڵێنی داوە و ضەمانی کردووە کە هەرکەس لە بەندەکانی بەراستی دەستی پێوە

---

٤ ) لە ماوەی ئەو چەند ساڵەی بانگەوازی پێغەمبەری خوادا (صلی الله علیه وسلم) لە مەککەدا، هەمووی تەنها بۆ یەکتاپەرستی خوای گەورە بوو، واتە تەوحید، وە نوێژ ساڵێك پێش هیجرەتی پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) لە مەککەوە بۆ مەدینە واجب کرا، جا ئاگادار بە !

٥ ) زانایان دەفەرموون: هۆکاری دژایەتی قورەیش ئەوەبوو کە پێغەمبەری خوا، بانگەوازی یەکتاپەرستی دەکرد، وە بانگەوازی پەرستن و بەندایەتی یەك خوای بە تاك و تەنها دەکرد، پاشان ئەوانیش شتی وایان زۆر پێ سەیر بوو، بۆیە بە پێغەمبەریان دەووت ساحیر و درۆزن، وە هەروەها هەندێك جاریش لەبەر بەلاغە وبەیانی قورئان بوو، چونکە تەواوی شاعیرەکانی مەککە و قورەیش لە بەرانبەر بەلاغە و بەیانی قورئان سەریان سورمابوو، چونکە ئەو زەمانە باو باوی بەلاغە بوو، وە قورئانیش تەحەدای تەواوی بەلاغ زانەکانی قورەیشی دەکرد، ئیتر بۆیە بێ باوەرەکان زۆر سەیریان لە بەلاغە و بەیانی قورئان هاتبوو، چونکە پێغەمبەری خوا ئەو شتانەی نە ئەزانی و خوێندەوای نەبوو، ئیتر تەنها دەیان ووت هەمووی سیحرە و فرت و فێڵە، ئەگەرنا (محمد) ئەمانە چۆن و لەکوێ وە خێرا فێر بوو ؟!

بگرن، هیچ كات بەرنابێت و جیانابێتەوە لێیان، وە بە پتەوی رایان بگرێت و نەپچڕێت، وە ڕزگاری و نەجاتی مرۆڤ تەنها بەم كۆڵەكە و پەتە مەتینەوەیە، واتە مرۆڤ هیچ كات نەجاتی نابێت و سەركەوتوو نابێت تەنها بە دەست گرتن بەم كۆڵەكەوە نەبێت، چونكە خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿لَا إِكْرَاهَ فِي الدِّينِ قَدْ تَبَيَّنَ الرُّشْدُ مِنَ الْغَيِّ فَمَنْ يَكْفُرْ بِالطَّاغُوتِ وَيُؤْمِنْ بِاللَّهِ فَقَدِ اسْتَمْسَكَ بِالْعُرْوَةِ الْوُثْقَى لَا انْفِصَامَ لَهَا﴾ البقره٢٥٦. واتە: زۆر لێكردن و ئیجباری كردنی هیچ كەسێك لە خاوەن نامە ئاسمانییەكان (یەهود و نەصارا) ناكرێت بۆ یەكتاپەرستی و تەوحید دوای باوەڕ هێنانی عەرەبەكان، چونكە ئیمان و كوفر، یان هەق و باطل، هەردووكیان ئاشكران و دیاری كراون، هەركەس بێ باوەڕ و كافر ببێت بە (طاغوت) واتە بە هەموو جۆرەكانییەوە، وەك گوێڕایەڵی فەرمانی شەیتان و پەرستن و بەندایەتی بت و دروست كراوەكان، وە باوەڕ و ئیمانی تەواوەتی بهێنێت بە خوای گەورە (الله) و ئەوەی ناردویەتی، ئەوە دەستی كردووە بە پەت و كۆڵەكەی مەتینەوە (العروة الوثقى) واتە (لاإله إلاالله) كە پێی دەڵێن یەكتاپەرستی یان تەوحیدی خوای گەورە، وە هیچ كات ئەو پەت و كۆڵەكە مەتینە پچرانی بۆ نییە، یان هیچ كات خاوەنەكەی لە نازو بەرەكەتی بەهەشت بێ بەش نابێت، یان هەرگیز بە سزای دۆزەخ سزا نادرێت )).

- بەشی یەكەمی ئایەتەكە خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿ **فَمَن يَكفُر بالطاغوت** ﴾ واتە هەركەس بێ باوەڕ (كافر) ببێت بە (طاغوت)، ئەم بەشەیان ئەو نەفی و بەدرۆخستنەوە و بێ باوەڕ بوونەیە كە پێك دێت لە بڕگەی یەكەمی شەهادەت (لاإله) هیچ خوایەك نییە بەهەق، و نەفی هەموو خواو پەرستراوەكانی دیكە دەكات.
- بەشی دووەمی ئایەتەكە ﴿ **ویؤمن بالله** ﴾ ئەمەشیان بە پێچەوانەی بڕگەی یەكەمەوەیە و، بۆ (ئیسپات) و باوەر هێنانە بە خوای تاك و تەنها، كە بڕگەی دووەمی شەهادەت (إلا الله) دەكات.

ئەو پەت و كۆڵەكە مەتینە (العروة الوثقى)ـیەی كە هیچ كات بەندە بەبێ پەیوەستی و دەست پێوە گرتنی (اعتصامی) نەجات و سەرفراز نابێت، ئەویش بریتیە لە (لاإله إلاالله)...

لەبەر ئەوە كۆڵەكە و پایەكانی ئیمان و باوەر زۆرن، وە خەڵكیش دەستیان لە هەمووی یان لە هەندێكی قایم بووە، هەندێكیان تەنها دەستی لە كۆڵەكەی نوێژ قایم

بووه، وه هەندێکی تریان دەستی تەنها لە کۆڵەکەی چاکە و کاری خێر قایم بووه، بەڵام ئەمانە هەمووی بە تەنها بەس نییە بۆ ڕزگاری و نەجات بوون و سەرفرازی، بەبێ دەست گرتن بە کۆڵەکە و بن هەنگڵی مەتینەوە (العروة الوثقى) واتە (لاإله إلاالله) نەبێت، چونکە بە هیچ جۆرێك هیچ جۆرە ڕزگاری و سەرفرازییەك نییە، ئیلا بە دەست گرتن و جێبەجێ کردنی ئەم کۆڵەکە و بن هەنگڵە مەتینەوە نەبێت (لاإله إلاالله)، هەتا ئەم کۆڵەکە مەتینە پێش هەموو کۆڵەکەکانی دیکە جێبەجێ نەکرێت هیچ کام لە کۆڵەکەکانی دیکە دانامەزرێت و وەرناگیردرێت، واتە ئەساس و کۆڵەکەی یەکەم پێش هەموو کۆڵەکەکانی دیکە بریتیە لە کۆڵەکەی (لاإله إلاالله)...[٦]

هەر بۆیە فیرعەونی ظالم و ستەم کار کاتێك هەلاك و تیاچونی لەسەر دابەزی و مردن و خنکان یەخەی گرت، پەنای نەبرد بۆ هیچ شتێك و نەگەرایەوە بۆ هیچ کارێك، تەنها ئەوە نەبێت، واتە بۆ کۆڵەکە ئەساس و پتەوەکە، بەڵام کەی؟ دوای ئەوەی کار لە کار ترازا و مەجال و فرسەتی نەما، بۆیە خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿ **وَجَاوَزْنَا بِبَنِي إِسْرَائِيلَ الْبَحْرَ فَأَتْبَعَهُمْ فِرْعَوْنُ وَجُنُودُهُ بَغْيًا وَعَدْوًا حَتَّى إِذَا أَدْرَكَهُ الْغَرَقُ قَالَ آمَنْتُ أَنَّهُ لَا إِلَهَ إِلَّا الَّذِي آمَنَتْ بِهِ بَنُو إِسْرَائِيلَ وَأَنَا مِنَ الْمُسْلِمِينَ** ﴾ یونس٩٠. واتە: ئێمە نەوەکانی ئیسرائیلمان (واتە موساو شوێن کەوتوەکانی) مان لە دەریای (سویس)ەوە پەڕاندەوە، پاشان فیرعەون و سوپاکەی شوێنیان کەوتن هەتا بیانگرنەوە، هەتا ئەو کاتە خەریك بوو فیرعەون بخنکێ و نوقم ببێت، جا کاتێك خۆی و سوپاکەی نوقمی ئاو بوون، و فیرعەون هیوای ڕزگار بوونی نەما، ئەوکاتە ووتی: ئەوە ئیمانم هێنا، کە جگە لەو خوایە کە نەوەکانی ئیسرائیل (موسا و شوێن کەوتوەکانی) ئیمانیان پێ هێناوە، هیچ پەرستراوێکی تر نییە شیاوی پەرستن و بەندایەتی بۆ کردن بێت، وە منیش لەو کەسانەم کە ملکەچی خوای گەورەن )).

وە هەر لەبەر گەورەیی و عەظەمەتی یەکتاپەرستی (تەوحید) لە فەرموودەیەکی صەحیحدا هاتووە لە ئیبن عەباسەوە ئەویش لە پێغەمبەری خوداوە (صلی الله علیه وسلم) فەرموویەتی: (( **والذي نفسي بيده لو جيء بالسماوات والأرضين ، ومن فيهن وما بينهن ، وما تحتهن فوضعت في كفة الميزان ووضعت شهادة أن لا إله إلا الله في الكفة**

٦ ) وەك شێخی پایە بەرزمان (محمد بن ناصرالدين الالبانی) ڕەحمەتی خوای لێ بێت دەفەرموێت: هەتا کۆڵەکە و پایەکان دروست نەکرێت سەقف دروست ناکرێت، یاخود ئەگەر کۆڵەکە بە تەواوی دانەمەزرێت وەك ئەوە وایە خانوو لەسەر دەریا دروست بکرێت. بەڵێ کۆڵەکەی مەتین پێش هەموو شتێکە (العقيدة اولاً).

**الأخرى لرجحت بهن ))**. واتە: سوێندم بەوەی کە گیانی منی بەدەستە، ئەگەر هەموو ئاسمانەکان و زەوی، و هەموو ئەوانەی لە بەینیدان و لە نێوانیاندان و لە ژێریاندان، هەموو پێکەوە بکرێنە سەر تای تەرازوویەك یان کێشانەیەك، وە شەهادەی (أن لاإله إلاالله) بکرێتە سەر تاکەی دیکەی، ئەوە کێشی شەهادەکە لەهە هەموویان قورستر دەبێت)).[7]

لەبەر ئەوە هیچ شتێك نییە گەورەتر و عەظیم تر بێت لە دوور خستنەوە و پارێزگاری کردن لەو مەترسییانەی کە ڕوو دەکەنە تەوحید و یەکتاپەرستی، ئەوە نابینی پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) هەموو کات لە کاتی خەم و خەفەتدا دەپارایەوە لە خوای گەورە و دەیفەرموو: (( **الله، الله ربي ولا اشرك به شيئا** )).[8] وە هەر لەبەر ئەوە پێغەمبەران کە زانا ترین و فەقیهترینی خەڵکی بوون، دەچوونە ناو نارەحەتی و مەصاعیبەکانەوە بە تەوحید و یەکتاپەرستی یەوە و، پەناو تەوەسولی شیان هەر بە خوای گەورە دەبرد پێی، لەبەر ئەوەی ئەیان زانی کە هیچ شتێك نییە گەورەتر و بەڕێز تر بێت لە خوای گەورە لە یەکتاپەرستی، وە ئەوەشی بەڵگەیە خوای گەورە لە زاری پێغەمبەر (یونس)ەوە (عليه السلام) دەفەرموێت: ﴿ **فَنَادَى فِي الظُّلُمَاتِ أَنْ لَا إِلَهَ إِلَّا أَنْتَ سُبْحَانَكَ إِنِّي كُنْتُ مِنَ الظَّالِمِينَ فَاسْتَجَبْنَا لَهُ وَنَجَّيْنَاهُ مِنَ الْغَمِّ وَكَذَلِكَ نُنْجِي الْمُؤْمِنِينَ** ﴾ الانبياء ٨٧-٨٨) واتە: یونس لە تاریکی یەکاندا.[9] هاواری کرد لە خوای گەورە و فەرمووی: ئەی خوای تاك و تەنها هیچ خوایەك نییە بە هەق شیاوی بەندایەتی بۆ کردن بێت جگە تۆ، وە هیچ کەس شك نابەم ڕزگارم بکات جگە لەتۆ، پاك و بێگەردی بۆ تۆ من لە ستەم کاران بووم.[10]، وە من پەشیمانم، وە ئێمەش وەڵامی

---

٧ ) **صحيح:** فەرموودەکە صەحیحە، ئیمامی حاکم بە صەحیحی ریوایەتی کردووە لە (المستدرك على الصحيحن) داو شێخ ئەلبانی لە (صحيح الترغيب والترهيب) دا بە ژمارەی (٤٥٦٦) دا بە تەحقیقی خۆی پلەی صحیحی پێداوە و دەفەرمووێت فەرموودەیەکی صەحیحە لەسەر زاری ئیمامی حاکمەوە.

٨ ) **صحيح:** فەرموودەکە صەحیحە، لە سوننەنی ئەبو داودا بە ژمارەی (١٥٢٥) هاتووە و ئیبن ماجەش بە ژمارەی (٣٨٢٨) هێناوییەتی و شێخ ئەلبانی لە سیلسیلەی صەحیحەدا بە ژمارەی (٢٧٥٥) و صحيح كلام طيبى ئیبن تەیمیە بە ژمارەی (١٢٢) هێناوییەتی و دەفەرموێت صەحیحە.

٩ ) ظلمات: تاریکی یەکان کە بەکۆ هاتووە مەبەست پێی سێ تاریکی یە: یەکەم تاریکی شەو، دووەم تاریکی دەریا، سێیەم تاریکی ناو سکی حوت.

١٠ ) مەبەست لە وتەکەی پێغەمبەر یونس سەلامی خوای لێ بێت، کە فەرمووی من ستەم کار بووم، پێی ئەوەیە کە ئەو بێ پرسی و فەرمانی خوای گەورە خاکەکەی خۆی بەجێ هێشت و چو بۆ خاکێکی دیکە هەتا بانگەواز بکات، چونکە قەومەکەی خۆی گوێیان بۆ ڕانەگرت .

داواکەیمان دایەوە و ڕزگار مان کرد لە سکی حوتەکە و غەم و پەژارەکەی، وە هەر بەو شێوازەش وەڵامی ئیمان داران دەدەینەوە )).

ئەگەر بەچاکی تێگەیشتی لەوەی کە باسمان کرد، لە گرنگی یەکتاپەرستی (لاإله إلاالله) وە گەورەیی و مەترسی و گرنگی، وە واتاکەی یەکتاپەرستی خوای گەورەیە بە بەندایەتی خوای گەورە بە تەنها، واتە: هیچ پەرستراوێك نییە بەهەق جگە خوای گەورە (الله)، ئەوە واجبە لەسەرت کە فێر ببیت واتای (العبادة).[11] بەندایەتی چییە، هەتا بەچاکی و تەواوەتی بتوانیت بەتاك و تەنها و بەتەواوەتی هەمووی بۆ خوای گەورە بکەیت، وە دوور بکەویتەوە لە بەندایەتی غەیری خوای گەورە،و بۆ کەسانی دیکەی بکەیت، بەهەر شێوازێك لە شێوازەکانی بەندایەتی، وە بەمانە یەکتاپەرستی بە تەواوەتی جێبەجێ دەبێت.

وە واجبە لەسەرت کە تێبگەیت لە واتای شیرك، کە لە بنەرەتدا دژی یەکتاپەرستی یە، هەتا خۆتی لێ بپارێزیت و لێی دوور بکەویتەوە.

وە پێش هەموو ئەمانەش بزانە کە (لاإله إلاالله) کۆمەڵێك مەرج و شەرتی هەیە، کە بەبێ ئەو مەرجانە راست و دروست نابێت و دانامەزرێت، ئەوانیش:

**یەکەم:** (العلم) زانین بە ماناو واتای (لاإله إلاالله) بە هەردوو بەشەکەی، واتە (نەفی) و (ئیسپات)، پێویستە زانیاری و عیلمێکی باشت هەبێت بەم دوو بنەما گەورە و ئەساسییەی شەهادەت، بەڵگەش بۆئەمە خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿**فاعلَم انَهُ لاإله إلاالله**﴾ محمد١٩) واتە: بەچاکی بزانەو فێر ببە کە هیچ خوایەك نییە بەهەق شیاوی بەندایەتی بۆ کردن بێت جگە زاتی پیرۆزی (الله) کە خوای تاك و تەنهاو بێ هاوەڵە)).

**دووەم:** (الیقین) دڵنیایی و دامەزراوی کە دژی شەك و گومانە و لای دەبات، چونکە پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) دەفەرموێت: (( **أسعد الناس بشفاعتي یوم القیامة من قال لا إله إلا الله خالصا من قلبه أونفسه**)).[12] واتە: خۆشبەخترین

---

١١ ) لە نامەی دووهەمدا باسی (العبادە) دەکەین إن شا ءالله.

١٢ ) **صحیح:** ئیمامی بوخاری لە صەحیحی بوخاریدا و کیتابی (عیلم) دا هێناوییەتی لە ئەبو هورەیرەی دوسی یەوە، هەروەها ئیمام ئەحمەدیش لە موسنەدەکەیدا بە صەحیحی هێناوییەتی.

کەسانێك لە ڕۆژی دواییدا بە شەفاعەتی من، ئەو کەسەیە کە دەڵێت : (لاإله إلاالله) خالیصەن بەبێ گومان لە دڵو ناخییەوە یان لە نەفسی یەوە )).[١٣]

**سێیەم:** (الصدق) ڕاستگۆیی کە دژی درۆیە، و بریتیە لەوەی هەرکەس دان بنێت بە شەهادەتەیندا لێی وەرناگیردرێت هەتا بە ڕاستی و صدقەوە لە دڵییەوە نەیڵێت، خۆ ئەگەر بە درۆوە بیڵێت حسابی مونافیق و دوو ڕووی بۆ دەکرێت، بەو بەڵگەی خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿ إنَ المنافقينَ في الدَرك الأسفل مِنَ النار ﴾ واتە: دوو ڕووەکان (ئەوانەی تەنها بە زووبان ئیمانیان هێناوە) لە ڕۆژی دواییدا دەکرێنە بنکی ئاگری دۆزەخەوە )).

**چوارەم:** (الاخلاص) دڵسۆزی کە دژی شیرك و هاوەڵ بۆ خوا دانانە، بەو بەڵگەی خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿ إنَهُ مَن يُشرِك بالله فَقَد حَرَمَ الله عَلَيه الجَنَة ﴾ واتە: هەرکەس شیرك بەخوای گەورە بکات، ئەوە خوای گەورە بەهەشتی لەسەر حەرام دەکات )).

**پێنجەم:** (المحبة) خۆشەویستی بۆ ئەم وشەیە، وە هەموو ئەو شتانەش کە بەڵگەن لەسەری .

---

١٣ ) سودێك (فائدە): هەندێك لە ئەهلی عیلم بۆ ئەوە چوون کە هاوشێوەی ئەم جۆرە فەرموودانە کە لەبارەی ئەوانەوە هاتوون دەڵێن: (( من قال لاإله إلاالله دخل الجنة )) أو حرم الله عليه النار )) و هاوشێوەیان، ئەمانە هەموویان لە سەرەتای ئیسلامدا بوون، چونکە ئەو کاتە دەعوە و بانگەواز تەنها بۆ یەکتاپەرستی و تەوحید بووە، بەلام کاتێك فەرائیزەکان فەرز کرا و سنورەکان دیاری کرا، ئەمە سڕایەوە و نەسخ بوویەوە، وە بەڵگەکانیش لەسەر ئەمە زۆر و ئاشکران، لەسەر ئەم قسەش ئیمامی (ضحاك) و (زوهری) و (سوفیانی ثەوری) و غەیری ئەوانیش لە ئەهلی عیلم بڕیاریان لەسەر داوە .

وە هەندێکی دیکە لە ئەهلی عیلم بۆ ئەوە چوون کە: هیچ پێویست بە بانگەوازی نەسخ بوونەوە و سڕینەوەی شتەکان ناکات، چونکە هەموو ئەو شتانەی کەلە فەرائیزەکانی ئیسلام و ئەرکانەکانی ئاین بن، پێویستی و لەوازمی شەهادەتەین و تەواوکەرین، واتە هەردوو شەهادەکە، خۆ ئەگەر شەهادەتەین هێنرا بەلام یەکێك لە فەرائیزەکان جێبەجێ نەکرا یان نکوڵی لێکرا، یان بە ئەنقەست و تەهاون، لەسەر تەفصیل و خیلاف و جیاوازی تێیدا، حوکمان داوە بەسەریدا بە کوفر و بێ باوەڕی، وە نەچونی بۆ ناو بەهەشت، وە ئەم قسەش نزیکە لە حەقەوە.

وە هەروەها دەستەیەکی تر لە ئەهلی عیلم بۆ ئەوە چوون کە: دان پێدانان بە وتەو کەلیمەی تەوحید و یەکتاپەرستی هۆکارو مەبەستێکە بۆ چوونە ناو بەهەشت و، ڕزگار بوون لە ئاگر، بەو مەرجەی خاوەنەکەی فەرائیزەکان جێبەجێ بکات، و دوور بکەوێتەوە لە تاوانە گەورەکان (الکبائر) خۆ ئەگەر فەرائیزەکان جێبەجێ نەکات و دوور نەکەوێتەوە لە تاوانە گەورەکان (الکبائر) ، وە تەنها دان پێدانانی بەوتەی یەکتاپەرستیدا هیچ ڕێگری لێ ناکات لە چونە ناو ئاگری دۆزەخ، وە ئەمەش نزیکترە لە حەق و صەوابەوە، لەوەی پێشتر یان ئەمە و ئەویش، والله اعلم/ الترغیب والترهیب للمنذري (٢/٤١٣،٤١٤).

**شەشەم:** (ألأنقياد لحقوقها) واتە تەسليم بوون و جێبەجێ كردنی مافەكانی، بەو بەڵگەی وەهبی كوری منبە دەفەرموێت: (( **لاإله إلا الله مفتاح الجنة، ولكل مفتاح أسنان فمن جاء بمفتاح له أسنان فتح له، ومن جاء بمفتاح ليس له أسنان لم يفتح له** )). واتە: (لاإله إلاالله) كليلی بەهەشتە، وە هەموو كليلێك ددانی خۆی هەیە، جا هەر كەس بە كليلێكەوە بێت كە ددانی پێوە بن ئەوە بۆی دەكرێتەوە، وە هەركەسیش بە كليلێكەوە بێت و ددانی نەبێت بۆی ناكرێتەوە )).

**حەوتەم:** (اجتناب نواقضها) دووركەوتنەوە لە هەڵوەشێنەرەوەكانی، كە هەڵوەشێنەرەوەكانی شەهادەتەین (ئیمان) زۆرن، كە مەترسیدار ترینیان بریتیە لە (شيرك) هاوەل بۆ خوا بریار دان، وە باسی هەندێك لە بەتاڵ كەرەوەكانی دێت.

وە بزانە ئەم یەكتا پەرستی یە زانایان و ئەهلی عیلم ناویان لێناوە (توحيد الالوهية) یان پێی دەڵێن (توحيد العبادة) یەكتاپەرستی بەندایەتی، وە دوو جۆری دیكەش لە یەكتاپەرستی هەیە، كە پێیان دەڵێن:

- **توحيد الربوبية:** یەكتاپەرستی خوایەتی، كە بریتیە لە باوەر بوون بەوەی كە هەر خوای گەورەیە (الخالق) بەدی هێنەر و، (الرازق) رۆزی دەر و، (المدبر) دارێژەرو بەرێوەبەری هەموو دونیا و كارەكان، ئەمەش هەر بەتەنها بەس نییە بۆ رزگار و نەجات بوون، چونكە موشريك و بێ باوەرەكانی قورەیش باوەریان پێی هەبوو، لەگەڵ ئەوەشدا نەبوونە موسوڵمان پێی، وە خوێن و ماڵیان نەپارێزرا، هەتا ئەو كاتەی باوەریان دەهێنا و یەكتایەرستی بەندایەتی (توحيد العباده)یان جێبەجێ دەكرد، وە بەرائەتیان دەكرد لە خوا باتڵ و درۆكانیان، بەو بەڵگەی خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿ **وَلَئِنْ سَأَلْتَهُمْ مَنْ خَلَقَ السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضَ وَسَخَّرَ الشَّمْسَ وَالْقَمَرَ لَيَقُولُنَّ اللَّهُ** ﴾ خۆ ئەگەر لێیان بپرسیت ئەی محمد ئایا كێ یە دروست كەرو بەدیهێنەری ئاسمانەكان و زەوی و، خۆر و مانگی بۆ رام كردوون؟ یەكسەر دەڵێن : الله )).
- **توحيد الأسماء والصفات:** یەكتاپەرستی سیفات و ناوە جوانەكانی خوای گەورە، ئەویش بریتیە لەوەی كە خوای گەورە وەسف بكەیت بەو جۆرە كە خۆی وەسفی خۆی داوە، بەبێ (تشبيه) چواندن، و (تمثيل) نمونة كردن، و (تَكَيُيف) چۆنێتی ، و (تعطيل) لەكار خستی سیفاتە بەرز و پیرۆزەكانی، وە هیچ كەس وەسف

نەدەین بە هیچ سیفاتێك لە سیفاتەكانی خوای گەورە، بەو بەڵگەی خوای گەورە خۆی دەفەرموێت:﴿ لَيسَ كَمِثْلِهِ شئ وَهوَ سَميعُ البَصيرِ ﴾ واتە: خوای گەورە هاوشێوەی نییە، نە لەزاتیا، نە لە سیفاتیا، نە لەكرداریا، نە لە توانایدا، بۆ خۆی تەنیایە و لە هەموو شتێك بیٚ نیازەو، هەموو شتێك نیاز مەندە بەو، وە بەهەموو شتێك بینەر و بیسەرە )).[١٤]

## (شیرك) هاوەڵ بۆ خوا بریار دان

الشرك: بزانە كە گەورەترین و خراپ ترین تاوان لای خوای گەورە، بریتیە لە (شیرك)، بەو بەڵگەی خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿ إنَ اللهَ لا يَغفِرُ أن يُشرِكَ بِهِ وَيَغفِرُ ما دونَ ذلِكَ لِمَن يَشاء ﴾ النساء ٤٨). واتە خوای گەورە هەرگیز خۆش نابێت كە شەریكی بۆ بریار بدرێت، واتە شركی پیٚ بكرێت، ئیتر لەوە بەدوا بۆ هەركەسێك كە خۆی بیەوێت و تەوبەی لیٚ بكات خۆش دەبێت)).

وە هەروەها پرسیاریان كرد لە پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) لەبارەی گەورەترین تاوانەوە، ئەویش فەرمووی: (( أن تَجعَلَ لله نداً وقد خلقك )) واتە: بریتیە لەوەی كە هاوەڵ بۆ خوای گەورە بریار بدەیت لەگەڵ ئەوەشدا هەر ئەوە بەدیهێنەرت ))، وە هەر شیركە كە بەهۆیەوە تەواوی كارە چاكەكانی دیكە بەتاڵ دەبێتەوە، بەو بەڵگەی خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿لَئِنْ أَشْرَكْتَ لَيَحْبَطَنَّ عَمَلُكَ﴾ خۆ ئەگەر هاوەڵت بۆ خوای گەورە بریاردا ئەوە چاك بزانە كە هەموو كارە چاكەكانت بەتاڵ دەبنەوە )).، وە شیركیش دوو جۆری هەیە، ئەوانیش شیركی گەورە و بچوك (اكبر والاصغر).

**یەكەم:** (<u>الشرك الاصغر</u>) شیركی بچوك: ئەویش بریتیە لە كەمێك ریبا و خۆ دەرخستن و سوێند خواردن بە غەیری خوای گەورە، وەك ئەو كەسەی سوێند بخوات بە پێغەمبەر یان كەعبە یان شەرەف یان هەر شتێكی دیكە، ئەوە دەبێتە شیركی بچوك، مەگەر ئەوە نەبێت كە خاوەنەكەی پێی وابێت كە ئەو شتەی سوێنی پیٚ دەخوات لە

١٤ ) قال العلامة ابن القيم رحمه الله : ( قوله : ليس كمثله شيء . .إنما قصد به نفي أن يكون معه شريك أو معبود يستحق العبادة والتعظيم " كما يفعله المشبهون والمشركون ، ولم يقصد به نفي صفات كماله ، وعلوه على خلقه ، وتكلمه بكتبه ، وتكلمه لرسله ، ورؤية المؤمنين له جهرة بأبصارهم كما ترى الشمس والقمر في الصحو . . ) اهـ.

خـوای گـەورە گـەورەتر بێـت، لـەم کاتـەدا دەبێتـە شـیرکی گـەورە، وە ئەمـەش کاتێـك دەردەکەوێت کە سوێند خواردن بە خوا لایـان زۆر سـادە و ئاسـان و فشـقیاتە، بـەلاّم بۆ غەیری خوا و شتە خۆشەویستەکانی دیکە (وەك شەرەف و نـاموس) زۆر لایـان گـران و بە هەیبەتە و لەسەر یان قورسە و لێی دەترسن.

**دووەم:** (الشرك الاكبر) : ئەویش بریتیە لەوەی کە کەسێکی دیکە بکەیتە هاوەڵ و شەریکی خوای گەورە و شەریکی بکەیت لە هەر جۆرێك لە جۆرەکانی بەندایەتی، وەك ئەوەی سوجدەی بۆ بەرێت یان نوێژی بۆ بکات یان لێی بپارێتەوە و لێی بترسێت یان خۆشی بوێت وەك خۆشەویستی خوای گەورە، یان پەنای بۆ بەرێت لە دورخستنەوەی زەرەر و راکێشانی خێر، کە هیچ کەس توانای نییە بۆی جگە لە خوای گەورە، یان گوێڕایەڵی و ئیتاعەی کەسێك بکات لە تەشریع و حەڵاڵ کردن و حەرام کردن، هەموو ئەمانە شیرکن بە خوای گەورە، وە لەمەوە دەزانیت کە شیرك بەتاڵ کەرەوەی تەوحیدە، کە رەنگە لە (ئولوهیەت) دا بکرێت، وە رەنگە لە (الاسمائو والصفات) دا بکرێت، بەوەی کە خوای گەورە وەسف بدرێت بە سیفەتێك لە سیفاتی بەندەکانی، وەك ئەوەی بڵێت دەستی خوا وەك دەستی دروست کراوەکانی وایە، وە خوای گەورەش لە وەسفی خۆیدا دەفەرموێت:﴿ **لَيسَ كَمِثلِهِ شئ وَهوَ سَميعُ البَصير** ﴾ واتە: خوای گەورە هاوشێوەی نییە، نە لەزاتیا، نە لە سیفاتیا، نە لەکرداریا، نە لە توانایدا، بۆ خۆی تەنیایە و لە هەموو شتێك بێ نیازەو، هەموو شتێك نیاز مەندە بەو، وە بەهەموو شتێك بینەر و بیسەرە )).، یان غەیری خوا وەسف بکەیت بە سیفەتێك لە سیفەتەکانی خوایەتی، یان ناوێکی بۆ دابنێیت بە ناوە بەرزو پیرۆزەکانی خوای گەورە، وەك ئەوەی موشریکەکان، (العزیز) یان کردبوو بە (العزى).

وە هەروەها واز هێنان لە نوێژ و تەرك کردنی، لەو شتانەیە کە پێغەمبەری خوا (صلى الله علیه وسلم) باسی کردووە لە ریزی شیرکدا، وە دەفەرموێت: ((**بين الرجل وبين الشرك والكفر ترك الصلاة**)).[١٥] واتە: لە نێوان پیاو و شیرك و کوفردا وازهێنان و تەرك کردنی نوێژە )).

داوا لە خوای گەورە دەکەم کە ئێمە و ئێوەش بپارێزێت لە شیرك، چونکە خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿ **إِنَّهُ مَنْ يُشْرِكْ بِاللَّهِ فَقَدْ حَرَّمَ اللَّهُ عَلَيْهِ الْجَنَّةَ** ﴾.

---

١٥ ) **صحيح** : رواه مسلم في كتاب الايمان عن جابر بن عبدالله رضي الله عنه عن النبي صلى الله عليه وسلم .

# نامەی دووەم

# بەندایەتی

# ( العبادة )

واتای بەندایەتی

جۆرەکانی بەندایەتی

مەرجەکانی دروستی بەندایەتی

بسم الله الرحمن الرحيم

## (معنى العبادة):

## واتای بەندایەتی

بەندایەتی لە زمانەوانیدا بە واتایی (الخضوع) ملکەچی و، (الانقیاد) تەسلیم بوون و (التذلل) سەر نواندن دێت، وەك دەڵێن : (بعیر معبد) وشترێکی گوێڕایەڵ، یان (طریق معبد) ڕێگەیەکی ملکەچ، واتە (مذلل سلس سهل الانقیاد) سەرنەوی و گوێڕایەڵ و ئاسان، وەك دەڵێن ڕێگاکە ئاسان هات بە دەستەوە ....

وە لە شەرعیشدا (شرعا) : بەو پەڕی غایەو خۆشەویستی لەگەڵ ملکەچ بوون دەڵێن، وەك شێخی ئیسلام ئیبن تەیمیە (ڕەحمەتی خوای لێ بێت) پێناسەی بۆ کردووە و دەفەرمووێت : ((العبادة: اسم جامع لكل ما يحبه الله ويرضاه من الاقوال والاعمال الباطنة والظاهرة )).[16] واتە بەندایەتی : ناوێکی کۆکراوە و گشت گیرە، لە هەموو ئەو شتانەی کە خوای گەورە خۆشی دەوێن و پێیان ڕازییە، لە وتە و کردەوە ڕواڵەتی و پەنهان (باطنی) یەکان )).

وە لەسەر ئەم پێناسە، واتا و مانای بەندایەتی کردن بۆ خوای گەورە، زۆر فراوانە، نەك بەو جۆرەی کە زۆربەی خەڵکی گومانی بۆ دەبەن و، کورتی دەکەنەوە تەنها لە لەسەر سجود و رکوع و نوێژ و ڕۆژو، وە لە هەمان کاتا و لەگەڵ ئەمەشدا، بە شێواز و جۆرەکانی دیکەی بەندایەتی، جگە لە خوای گەورە بەندایەتی بۆ کەسانی دیکە دەکەن، بێ ئەوەی بزانن و هەستی پێ بکەن، دەکەونە شیرك و هاوەڵ دانان بۆ خوای گەورە، کە هەرکەس ئەنجامی بدات و لەسەری بمرێت و تەوبەی لێ نەکردبێت، هەرگیز خوای گەورە لێ خۆش نابێت و نای بورێت، بەو بەڵگەی لە سورەتی (النساء) دا دەفەرمویێت : ﴿إِنَّ اللهَ لا يَغفِرُ ان يُشرِكَ بِهِ وَيَغفِرُ ما دونَ ذلِكَ لِمَن يَشاءُ﴾٤٨).واتە خوای گەورە هەرگیز خۆش نابێت کە شەریکی بۆ بریار بدرێت، واتە شیرکی پێ بکرێت، ئیتر لەوە بەدوا بۆ هەرکەسێك کە خۆی بیەوێت و تەوبەی لێ بکات خۆش دەبێت )).

---

١٦ ) دەتوانیت بگەڕێییتەوە بۆ پەرتوکی (العبادة) کە شێخی ئیسلام ئیبن تەیمیە (رحمە الله) دایناوە ..

کەواتە، ئەو کەسەی ڕێگەی نەجات و سەرفرازی و ڕزگار بوونی ئەوێت لە ئاگری دۆزەخ و دەیەوێت بچێتە بەهەشت، واجبە لەسەری تێبگات لە واتای بەندایەتی و جۆرەکانی، هەتا بە تاك و تەنها خالیصەن بۆ خوای گەورەی بکات (سبحانە وتعالی)، چونکە حەقی خوای گەورە بەسەر بەندەکانییەوە ئەوەیە کە بە تەنها بەندایەتی (عیبادەت) بۆ ئەو بکەن، خۆ ئەگەر ئەوانیش (بەندەکانی خوای گەورە) ئەوەیان کرد، ئەوە حەقە لەسەر خوای گەورە بیان کاتە بەهەشت، وەك لە فەرموودەکەی مەعاذی کوری جەبەلدا هاتووە خوای لێ ڕازی بێت...[١٧]

هەروەها وشەی (العبادة) بەندایەتی بەواتای پەرستش و تەنەسوك و (التألە)یش دێت: وەك سجود و رکوع و نوێژ، وە هەروەها دوعا و پارانەوە، لەوانەش (الاستغاثة) هانا هێنان کاتی تەنگانە و نارەحەتی، کە هیچ کەس توانای وەلاّم دانەوەی نییە جگە لە خوای گەورە، ئەمەش بەهەمان جۆر یەکێکە لەو بەندایەتی و پەرستشانەی کە دروست نییە بۆ غەیری خوای گەورە بۆ هیچ کەسێکی تر بکرێت، وە هەروەها (الاستعاذة) پەناگرتن بە خوای گەورە لە شەڕو کەیدی شەیتان و ئەولیائەکانی، بەو بەڵگەی خوای گەورە لە سورەتی (الجن)دا دەفەرموێت: ﴿وَأَنَّهُ كَانَ رِجَالٌ مِنَ الْإِنْسِ يَعُوذُونَ بِرِجَالٍ مِنَ الْجِنِّ فَزَادُوهُمْ رَهَقًا﴾ ٦) واتە: پیاوانێك لە ئینسەکان پەنایان دەگرت بە پیاوانێك لە جنەکان، ئەوانیش ئەم سەرلێ شێواویەیان قواستەوە و زیاتر گومڕایان کردن و ترساندیانن )).[١٨]

---

١٧ ) تەواوی فەرموودەکە بەم جۆرەیە :

عن معاذ بن جبل قال: قال النبي صلى الله عليه وسلم: (( يا معاذ أتدري ما حق الله على العباد ؟ ))، قال: الله ورسوله أعلم ، قال: (( أن يعبدوه ولا يشركوا به شيئا ، أتدري ما حقهم عليه ؟ ))، قال : الله ورسوله أعلم، قال: (( أن لا يعذبهم )). متفق عليه: رواه البخاري ومسلم/ واتە: مەعاذی کوری جەبەل دەگێڕێتەوە، پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) جارێکیان فەرمووی: (( ئەی مەعاذ ئایا ئەزانی حەقی خوای چییە بەسەر بەندەکانییەوە ؟)) منیش وتم : خوا و پێغەمبەرەکەی ئەزانن، پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) فەرمووی : (( حەقی خوا بەسەر بەندەکانییەوە ئەوەیە کە بە تەنها بەندایەتی بۆ بکەن و هاوەڵی بۆ بڕیار نەدەن، پاشان فەرمووی ئەی ئایا ئەزانی مافی بەندەکان چییە لەسەر خوای گەورەوە؟ )) وتم: خواو پێغەمبەرەکەی ئەزانن، فەرمووی : (( ئەگەر ئەوان ئەوەیان کرد، ئەویش سزایان نەدات، واتە نەیان کاتە ئاگری دۆزەخ )).

١٨ ) زانایانی تەفسیر (ئیبن کەثیر) و (طەبەری) و (سەعدی) و غەیری ئەوانیش دەفەرموون :

هەندێك لە هاوەڵاّن (وەك ئیبن عەباس و ئەبی سائیب و حەسەن و ئیبراهیم و قەتادە و .... ))لە پێغەمبەری خوداوە (صلى الله عليه وسلم) دەگێڕنەوە: ئەم ئایەتە کاتێك نازڵ بوو کە لە زەمانی جاهیلیدا ئەگەر کۆمەڵێك پیاو بە شەودا سەفەریان بکردایە و ڕێیان بکەوتایەتە دۆڵ و شیو و شوێنی تاریکەوە، زۆر دەترسان و پەنایان دەبردە

وه هەروەها (الذبح) سەربڕین و قوربانی کردن و (النذر) نەزر کردن و هاوشێوەیان، هەمووی لەو پەرستش و بەندایەتی یانەیە کە دەبێت تەنها بۆ خوای گەورە بکرێن و نابێت بۆ غەیری ئەو بکرێن، بە بەڵگەی ئەوەی خوای گەورە لە سورەتی (الانعام) دا دەفەرموێت: ﴿ **قُلْ إِنَّ صَلَاتِي وَنُسُكِي وَمَحْيَايَ وَمَمَاتِي لِلَّهِ رَبِّ الْعَالَمِينَ لَا شَرِيكَ لَهُ وَبِذَلِكَ أُمِرْتُ وَأَنَا أَوَّلُ الْمُسْلِمِينَ** ﴾ ١٦٢ – ١٦٣) واتە : ئەی محمد بە یەهود و نەصارا و ئەو موشریکانەی مەککە و دەور و بەری بڵێ: کە نوێژ و ( فەرزەکان و سوننەت، یان هەر پێنج نوێژەکان) حەج و قوربانی و ژیان و مردنم، بۆ خوای هەموو جیهانیان (یان خوای جن و ئینسەکان، یان دونیا و دواڕۆژ) دەکەم، وە هیچ هاوەڵێکی نییە و خالیصەن و بەبێ شەریك دانان بۆی بەندایەتی بۆ دەکەم، وە بێ گومان منیش یەکەم موسوڵمانی ئەم ئوممەتەم )).

وە هەروەها لە ئایەتێکی دیکەدا و لە سورەتی (الکوثر) دا دەفەرموێت: ﴿**فَصَلِّ لِرَبِّكَ وَانْحَرْ**﴾ ٤) واتە : نوێژ بکە بۆ خوای گەورە و پاشان قوربانیشی بۆ بکە و خوێنی بۆ بڕێژە)).[19]

کەواتە قوربانی و سەربڕین واجبە وەك نوێژ کردن تەنها بۆ خوای گەورە بکرێت و، وە هەروەها نزا و پارانەوە (دوعا)یش بەهەمان جۆر واجبە تەنها بۆ خوای گەورە بکرێت، چونکە دوعا و پارانەوەش هەر لە جۆر و توخمی بەندایەتی و پەرستشن، بەو بەڵگەی لە فەرموودەیەکی صەحیحدا کە نوعمانی کوری بەشیر خوای لێ ڕازی بێت دەگێڕێتەوە جارێکیان پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) فەرمووی : ((**إن الدعاء هو العبادة ثم قرأ : وقال ربكم ادعوني أستجب لكم**)).[20] واتە نزا و پارانەوە و دوعا

---

بەر سەیدی جنۆکەکانی ئەو ناوچەیە و، دەیان ووت: ((: أعوذ بعزيز هذا الوادي من شر سفهاء قومه)) واتە پەنا دەگرم بە گەورە و عەزیزی ئەم دۆڵە، لە خراپەی نەزان و سوفەهاکانی گەلەکەی )). ئیتر ئەوانیش زیاتر دەیان ترساندن ....

١٩ ) ئیبن عەباس خوای لێ ڕازی بێت لە (تنوير المقباس) دا دەفەرموێت: ((فَصَلِّ لِرَبِّكَ)) واتە نوێژی جەژن بکە (قوربان و ڕەمەزان)، وە هەروەها ((وانحر)) واتە قوربانی بکە لە ڕۆژی جەژنی قورباندا پاش ئەوەی نوێژی جەژنت کرد لە (المصلى)، وە ئیبن عەباس دەفەرموێت: ئەم ئایەتە بەڵگەیە لەسەر واجبی قوربانی کردن لە ڕۆژی جەژنی قورباندا پاش ئەنجامدانی نوێژی جەژن .. والله اعلم

٢٠ ) صحيح : ئیمامی ئیبن ماجە بە ژمارەی (٣٨٢٨) هێناوییەتی و ئیمامی ترمذیش بە ژمارەی (٢٩٦٩) هێناوییەتی و، شێخ ئەلبانی لە (مشكاة المصباح) و (السلسلة الصحيحة) و (صحيح الترغيب والترهيب) و (الادب

کردن بریتیە لە بەندایەتی کردن)) پاشان ئەم ئایەتەی خوێندەوە (( خوای گەورە فەرمووی لێم بپاڕێنەوە هەتا وەڵامتان بدەمەوە و ئیستجابەتان بکەم)).[21]

وە هەروەها (العبادة) بەندایەتی بەواتا و مەبەستی (الطاعة) گوێڕایەڵی کردن و (الانقیاد) تەسلیم بوونی تەواوەتی (مطلق)یش دێت، چونکە خوای گەورە (سبحانە وتعالی) لە سورەتی (یس) دا دەفەرمویێت: ﴿أَلَمْ أَعْهَدْ إِلَيْكُمْ يَا بَنِي آدَمَ أَنْ لَا تَعْبُدُوا الشَّيْطَانَ إِنَّهُ لَكُمْ عَدُوٌّ مُبِينٌ﴾ ٦٠) واتە ئەی نەوەکانی ئادەم پێشتر ئاگادارم نەکردنەوە لەسەر زوبانی پێغەمبەران کە شەیتان نەپەرستن و بەندایەتی بۆ نەکەن (گوێڕایەڵی بۆ نەکەن)، چونکە ئەو دوژمنێکی ئاشکرای ئێوەیە، وە فەرمانیشم پێ نەکردن کە بەتەنها من بپەرستن و بەندایەتی و عیبادەت بە تەنها بۆ من بکەن، چونکە ئەمەیە ڕێگەی ڕاست ، واتە (التوحید) یەکتاپەرستی )). لێرەدا گوێڕایەڵی کردن شەیتان بەندایەتی و عیبادەت بۆ کردن یانە، واتە بەندایەتی کردن بۆ شەیتان بریتیە لە گوێڕایەڵی کردنی...

وە هەروەها وتەی خوای گەورە لە بارەی فیرعەون و دارو دەستەکەیەوە، کە لە سورەتی (المؤمنون) دا دەفەرمویێت: ﴿ فَقَالُوا أَنُؤْمِنُ لِبَشَرَيْنِ مِثْلِنَا وَقَوْمُهُمَا لَنَا عَابِدُونَ ﴾٤٧) واتە : جا کاتێك موسا و هارونی برایمان پێکەوە نارد بۆلای فیرعەون و دارو دەستەکەی بە کۆمەڵێك موعجیزە و بەڵگەی ئاشکراوە، کەچی زۆر بە فیز و لوت بەرزییەوە وتیان : جا ئێمە ئیمان بە دووکەسی وەك خۆمان بێنین، کە هاوشێوی خۆمانن و هیچیان زیاتر نییە لە ئێمە ؟!، لە هەمان کاتیشدا هەموو گەل و هۆز قەومەکەشیان پێکەوە بەندە و خزمەت گوزار و ملکەچی خۆمانن)).مەبەست لێرەدا بە (عابدون) بریتیە لە (العبادة) بەواتای ئیطاعە و گوێڕایەڵی و تەسلیم بوونی تەواوەتی لە هەموو شتێکدا، ئەمەش دەبێت تەنها بۆ خوای گەورە بکرێت، و نابێت بۆ کەسێکی

---

المفرد) دا پلەی صەحیحی پێداوە و دەفەرمێت (رجالهم کله ثقات) واتە هەموو پیاوانی سەنەدەکەی جێگەی متمانەن ...

٢١ ) تێبینی :

ئەم فەرمووده بە شێوازێکی دیکە هاتووە کە ئەنەسی کوری مالیك خوای لێ ڕازی بێت دەگێڕێتەوە پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) فەرموویەتی (( الدعاء مخ العبادة ))، بەم لەفزەیان ڕاست نییە و لاوازە، وە شێخی ئەلبانی رەحمەتی خوای لێ بێت لە (السلسلة الضعیفة) و (جامع الترمذي) و (ضعیف الترغیب والترهیب) دا پلەی لاواز (ضعیف) ی پێداوە و دەفەرمووێت فەرموودەیەکی لاوازە و صەحیح نییە (٢٢٣٠) والله اعلم ....

دیکه بکرێت، خۆ ئەگەر ئەم جۆرە گوێڕایەڵی یە بۆ غەیری خوا کرا، ئەوە دەکرێت بە دوو جۆرەوە (واتە دوو حوکمی هەیە) ئەوانیش :

- (إطاعة) گوێڕایەڵییەك لە تاوان (مەعصیەت) و بێ ئەمری خوای گەورە، کەپێی دەوترێت (الطاعة في معصیة الله)، ئەویش بەبێ حەڵاڵ کردن و شەرعاندنی ئەو تاوانە (بدون استحلال المعصیة): وەك ئەوەی شەیتان زینا و داوێن پیسی بۆ بڕازێنێتەوە و ئەویش (بەندە) بەگوێی بکات، یان گەورە (سەید)ەکەی فەرمانی پێ بکات بە خواردنی مەشروب (عەرەق) و ئەویش بەگوێی بکات و بیخواتەوە، یان سەرکردە و پێشەواکەی فەرمانی پێ بکات بە تاشینی ڕیش و ئەویش گوێڕایەڵی بکات، وە پێشی وابێت کە ئەو کارانە حەرامن و نابێت ئەنجامیان بدات، ئەم گوێڕایەڵی یانە هەموویان دەچنە ژێر چەمك و واتای (عیبادەت) بەندایەتی و پەرستش کردنەوە، وە بە بکەرەکەشی دەوترێت (عابداً للشیطان) بەندەی شەیتان، واتە شوێن کەوتەی شەیتان، وە ئەنجام دەرانی ئەم کارانەش (زینا و دزی و تاشینی ڕیش و ....) بێ باوەڕ (کافر) نابن، مەگەر ئەو کاتەی پێیان حەڵاڵ بێت، واتە کاتێك تاوانێك ئەنجام دەدات و پێی حەڵاڵ و ڕەوایە، بەڵکو ئەو بکەرە تاوان بارە و کارەکەشی حەرامە و تێپەڕاندنی سنوری خوای گەورەیە، وە پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) ئوممەتەکەی لێ ئاگادار کردۆتەوە و حەزەری پێداون بە توند ترین حەزەر و، دەفەرموێت: ((لا طاعة في مخلوق (أو بشر) في معصیة الله (او ألخالق)، إنم الطاعة في المعروف )).[22] واتە بەهیچ جۆرێك گوێڕایەڵی و ئیطاعەی هیچ دروست کراوێك (یان مرۆڤێك) نییە و ناکرێت، لە تاوان و سەرپێچی و بێ ئەمری خوای گەورە، بەڵگو گوێڕایەڵی و ئیطاعە تەنها لە کاری چاکە و مەعروفدا دەکرێت)). واتە کارێك کە ڕەزامەندی خوای گەورەی لەسەر بێت...[23]

---

٢٢ ) صحيح : ئیمامی ئەحمەد لە (موسنەد)ەکەیدا هێناوییەتی و ئیمامی موسلیم لە صەحیحەکەیدا (صحيح المسلم) داو ئیمامی ترمذیش لە (سونەن)ەکەیدا بە ژمارەی (٣٦٩٦) هێناوییەتی و شێخ ئەلبانیش دەفەرموێت فەرموودەیەکی صەحیحە و پیاوەکانی هەموو جێگای متمانەن، و لە (السلسلة الصحيحة) دا و (مشكاة المصباح) و (الترغيب والترهيب) دا بە صەحیحی تەخریجی کردووە ...

٢٣ ) تەواوی فەرموودەکە لە موسنەدی ئیمام ئەحمەد ڕەحمەتی خوای لێ بێت بەم جۆرە هاتووە :

• (إطاعــة) گوێڕایــەڵی و ئیطـاعــەت کــردن لــە حــوکم و تەشــریعدا (الحکـم والتشریع) واتـە لـە حـەلاڵ کـردن و حـەرام کردنـدا (التحلیل والتحریم)دا : ئـەم جۆرەیـان بـەهیچ شـێوازێك نابێـت بـۆ غـەیری خـوای گـەورە بکرێـت و ئیطـاعـەو گوێڕایەڵی هیچ کەسێك بکرێت بۆی جگە لە خوای گەورە، خۆ ئەگەر بۆ غەیری خـوای گـەورە کـرا (صُـرِفَ)، ئـەوە دەبێتـە هـاوەڵ دانـان بـۆ خـوای گـەورە، کـە پێـی دەوترێـت: (الشـرك الاکبر)، چـونکە حـوکم و تەشـریع (حـەلاڵ و حـەرام) دەبێـت بـۆ خـوای تـاك و تـەنها و قـەهار بێـت و نابێـت بـۆ غـەیری ئـەو بکرێـت، چـونکە خـوای گەورە لە سورەتی (الکهف) دا دەفەرموێت: ﴿وَلَا يُشْرِكُ فِي حُكْمِهِ أَحَدًا﴾٢٦). واتـە هـیچ کەسـێك هاوکـاری خـوای گـەورەی نـەکردووە و ناکـات و هـاوەڵی نییـە لـە حوکم و بڕیاریدا )).[٢٤]

وە هـەروەها خـوای گـەورە لـە سـورەتی (یوسـف) دا دەفـەرموێت: ﴿ إنِ الحُكمُ إلا لِلهِ ﴾٤٠) واتە: هەموو حوکم و بڕیارێك تـەنها و تـەنها بـۆ خوایـە و هـەر هـی ئەوە، وە دەبیٚ تەنها ئەو حاکم و بڕیار بە دەست بێت )).

حـوکم (بڕیـار) و تەشـریع لـە تایبـەت تـرین (أخـص) تایبـەت مەندییـەکانی (خصـائص) عبودییـەت (یـان ئولوهییـەت) ی خـوای گـەورەیـە، لەبـەر ئـەوەش یـەکێك لـە واتاکانی وشەی (ألإلـه) بریتیـە لـە : (ألمُشـرِع)، واتـە شـەرع دانـەر، شـەرع بەدەسـت، وە هـەروەها یـەکێك لـە نـاوە بـەرز و پیرۆزەکـانی خـوای گـەورە (ألحَکَـم) و (ألحَکـیم)ە، وە لەسـەر ئـەوەش، هەرکـەس شـەریعەتێك یـان حوکمێـك فـەرز بکـات یـان دابنێـت جگـە لـە حوکم و شەرعی خوای گەورە (عزوجل) ئەوە نەفسی خۆی داوەتـە پـاڵ سیفەتێك لـە سیفەتەکانی (ئولوهییەت یان عبودییەت) واتە عیبادەت، واتە ئەوەی خـاوەن سیفەتێك (صفات)ە لە سیفەتەکانی خوایەتی، وە بەو جۆرەش وەکو (فیرعـەون) کاتێك ووتـی: ﴿

عن ابن مسعود ، أن النبي صلى الله عليه وسلم قال : (( كيف بك يا عبد الله ، إذا كان عليكم أمراء يضيعون السنة ، ويؤخرون الصلاة عن ميقاتها ؟ قال : كيف تأمرني يا رسول الله ؟ قال : تسألني ابن أم عبد ، كيف تفعل ؟ لا طاعة لمخلوق في معصية الله عز وجل )).

٢٤ ) تێبینی :

ئیبن مەسعود و ئیبن عامر و حەسەن و ئەبو رەجائو قەتادە جەحدەری بە (( ولا تشرك في حكمه أحدا )) بە تائی سەرەتا خوێندویانەتەوە، واتە (( ولا يشرك )) بە (( ولا تشرك )) خوێندراوەتەوە، ئەگەر بەمە بێت ئەوە واتاکەی زۆر قورس تر دەبێت. والله أعلم / تەفسیری (قورطبی) خوا لێی خۆش بێت .

ما عَلِمتُ مِن إلهٍ غَيري ﴾ القصص٣٨) واتـه: مـن بۆ ئێوە کەسێکی تـر شـك نابـەم خواتان بێت، بێجگە لە خۆم )).[٢٥]

وە بەڵگەش لەسەر ئەوەی کە تـەنها گوێڕایـەڵی کـردن و شـوێن کـەوتن بـۆ غـەیری خوای گەورە، لە حوکم و تەشریعدا دەبێتە شیرکی گەورە و بە شیرکی گەورە دادەنرێت زۆرن، لەوانـەش، وتـەی خـوای گـەورە کـە لـە سـورەتی (الانعـام) دا دەفـەرموێت: ﴿ وَإنَّ الشياطينَ لَيُوحُونَ إلى أوليآئِهِم لِيُجادلُوكُم وَإن أطَعتموهم إنَكُم لَمُشرِكون ﴾ ١٢١) واتـە: بـزانن کـە شـەیاطینـەکـان هـەمووکات شـتی پڕوپـوچ و وەسوەسـە و شـوبهات دەخەنـە دڵـی دۆسـت و ئەولیائەکانیانـەوە (مەبەسـت پێـی ئـەبو ئـەحوەص و شـوێن کەوتوەکانیەتی)، و هەڵیان دەنێن، بۆئەوەی موجادەلە و دەمە دەمێ تان لەگەڵ بکەن لە بارەی (خواردنی گۆشتی ملدارەوە بـوو، و شیرك، و بانگەوازی ئـەوەی کـە فریشـتەکان کچی خوان) خۆ ئەگـەر بـەگوێتان کـردن و هاتنـە سـەر ئـەو بیرو بـاوەڕە بەتاڵـەی ئـەوان، دڵنیـابن ئێوەش وەك ئـەوانن (واتـە موشـریکن) و هـیچ جیـاوازی تـان نییـە لەگـەڵ ئـەو موشریکانە )) چونکە شوێن کەوتنی غـەیری حـوکم و شـەریعەتی خـوای گـەورە کـوفر و شیرکە بە خوای گەورە ...

دەبینین لێرەدا تەنها گوێڕایەڵی کردنی هاوەڵان و ئەولیائی شەیتانەکان شیرکە و بەندایـەتی و عیبـادەت کردنـە بـۆ غـەیری خـوای گـەورە، چـونکە گوێڕایـەڵی و طـاعـەت کردنێکە لە حوکم و تەشریعدا، واتە لـە حـەڵاڵ و حەرامدا، کـە نابێـت بـۆ غـەیری خـوای گەورە بکرێت، وەك ئیمامی حاکم و ترمذی و غـەیری ئەوانیش بـە سـەنەدێکی صـەحیح لە ئیبن عەباسـەوە خـوای لێ ڕازی بێـت دەگێڕنـەوە: (( أن أناسا من المشركين كانوا يجادلون المسلمين في مسألة الذبح وتحريم الميتة فيقولون: تأكلون مما قتلتم ولا تـأكلون ممـا قتـل الله. يعـني الميتـة )) فقـال الله تعـالى : ﴿وَإن أطَعتمـوهُم إنَكُـم لَمُشرِكون﴾.[٢٦] واتە: خەڵکانێك لە موشریکان موجادەلەی موسوڵمانەکان (هاوەڵـەکان)

---

٢٥ ) ئیبن عەباس خوای لێ ڕازی بێت دەڵێت ئەم قسەی فیرعەون کە ووتی (( ما علمت من إله غيري )) لەگەڵ قسەکەی دیکەی کە بە گەلەکەی ووت : ((أني ربكم الأعلى)) ماوەی ٤٠ ساڵیان بەین بووە ... والله أعلم

٢٦ ) صحيح : ئیمامی حاکم لە (موسنەد)ەکەیدا و ئیمامی طەبەری لە (جامع البيان) دا بە ژمارەی (١٢٦٠٢) هێناوییەتی و ئیمامی ترمذی لە (سوننەن)ەکەیدا بە ژمارەی (٢٦٣) و موجاهدیش لە تەفسیرەکەیدا بە ژمارەی (١٢٦٠٢) هێناوییەتی و، ئیمامی ئیبن ئەبی حاتەمیش لە تەفسیرەکەیدا بە ژمارەی (٧٨٧٥) هێناوییەتی و شێخ ئەلبانی لە (سوننەتی ترمذی) دا پلەی صەحیحی پێداوە و دەفەرمووێت فەرموودەیەکی صەحیحە ...

یان دەکرد، و موناقەشەیان دەکردن لەبارەی مەسەلەی سەربڕین و حەرامی خواردنی گۆشتی ملدارەوە بوو، وە ئەیان ووت: ئێوەی موسوڵمان ئەوەی خۆتان دەیکوژن و سەری دەبڕن دەیخۆن، بەڵام ئەوەی خوا خۆی دەیکوژێت نایخۆن؟ واتە ملدارەوە بوو)) ئیتر خوای گەورە لە وەڵامی ئەم موشریکانەو ئاگادار کردنەوەی هاوەڵەکانی پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) ئەم ئایەتەی نارده خوارەوە (نازڵی کرد) : ((خۆ ئەگەر بەگوێتان کردن و هاتنە سەر ئەو بیرو باوەڕە بەتاڵەی ئەوان، دڵنیابن ئێوەش وەك ئەوانن (واتە موشریکن) و هیچ جیاوازی تان نییە لەگەڵ ئەو موشریکانە )).[27]

دەبینین تەنها گوێڕایەڵی و ئیطاعە کردن لەم جۆرە شتانەدا، بەشیرك دادەنرێت، هەر بۆیە زانای تەفسیر (ئیبن کەثیر) خوا لێی خۆش بێت دەفەرموێت: (( أي حَيثُ عَدَلتُم عن أمر الله لكم و شرعه إلى قولِ غَيره فَقَدَمتم عليه غيره فهذا هو الشرك )) أنتهى كلامه رحمه الله/ واتە: هەرکاتێك ئێوە پشتان کرد لە بڕیار و حوکمی خوای گەورە و شەریعەتەکەی، بۆ قسە و فەرمانی کەسانی تر و، فەرمانی کەسانی ترتان خستە پێش فەرمان و حوکمی خوای گەورە، ئەوە شیرکە، واتە شەریك تان بۆ خوای گەورە بڕیار داوە )).

وە هەروەها هەرکەس گوێڕایەڵی و ئیطاعەی (العلماء) زانایان و (الامراء) کاربەدەستان و (الحكام) فەرمان ڕەواکان بکات، لە حەرام کردنی ئەو شتانەی کە خوای گەورە حەڵاڵی کردن و حەڵاڵ کردنی ئەو شتانەی کە حەرامی کردوون (في التحليل والتحريم) لە فەتواکانیاندا، یان قانون (قەوانین) و یاسا و دەستورەکانیاندا، کە حوکمی خەڵکی پێ دەکەن، ئەوە کراونەتە خوا و ئەرباب جگە لە خوای گەورە، واتە کراونەتە خوایەکی دیکە لە پاڵ خوای گەورەدا (والعياذوا بالله)، بەوەش دەبنە موشریك و هاوەڵ دانەر بۆ خوای گەورە، وە بەڵگەشمان لەسەر ئەمە، ئەو ئایەتەی سورەتی (التوبة) یە کە خوای گەورە لە بارەی شوێن کەوتوانی نامە ئاسمانییەکان، ئەهلی کیتاب (واتە یەهود و نەصارا) کان دەفەرمووێت: ﴿**اتَخَذوا أحبارَهُم وَ رُهبانَهُم أرباباً مِن دون الله**﴾(٣١).[28] واتە : لە بری خوا زانا و روهبانەکانی خۆیانیان کردە

---

٢٧ ) تێبینی :

موشریکەکان باوەڕیان وابوو کە : ئەو گیاندارەی ملدار دەبێتەوە (تۆپیو) بکوژەکەی خوای گەورەیە، واتە ڕۆحی ئەو گیاندارەی سەر دەبڕدرێت و ئەوەشی بۆخۆی ملدار دەبێتەوە هەر بە دەستی خوایە و خۆی دەیمرێنێت!!

٢٨ ) هۆکاری دابەزینی ئایەتەکە بەم جۆرە بوو:

خوای خۆیان!، وه حه‌رامیان بۆ حه‌لاڵ کردن و حه‌لاڵ یان بۆ حه‌رام کردن )). أحبار: زاناکانی گه‌لی یه‌هوده، وه رهبان: له‌خوا ترس و قه‌شه ره‌بانییه‌کانن، که یه‌هودییه‌کان (أحبار) و نه‌صاراکان (روهبان)ه‌کانیان کردبووه خوای خۆیان، نه‌ك به‌و جۆره‌ی شوێن که‌وته‌کانیان (یه‌هود و نه‌صارا) ئه‌وانیان کردبێت به په‌روه‌ردگار (ئه‌رباب) و سجود و رکوع یان بۆ به‌رن و نوێژیان بۆ بکه‌ن، نه‌خێر، به‌ڵکو به گوێڕایه‌ڵی و ئیطاعه کردنیان بۆ ئه‌حبار و روهبانه‌کان له حوکم و ته‌شریعدا- واته حه‌لاڵ و حه‌رام دا، چونکه ئه‌م جۆره گوێڕایه‌ڵی و طاعه‌ته به‌ندایه‌تی و عیباده‌ته، وه‌ك رکوع و سجود و نوێژ و ڕۆژو و هه‌موو عیباده‌ته‌کانی دیکه، که ده‌بێت ته‌نها بۆ خوای گه‌وره (عزوجل) بکرێت و نابێت له غه‌یری ئه‌و بۆ هیچ که‌سێکی دیکه بکرێت، هه‌ر له‌به‌ر ئه‌وه خوای گه‌وره له ته‌واو کردنی ئایه‌ته‌که‌دا لۆمه و سه‌رکۆنه‌یان ده‌کات و ده‌فه‌رموێت: ﴿ **وَما أُمِروا إلا ليَعبدوا إلهاً واحِدا لاإله إلا هو سُبحانَهُ عَما يُشرِكون** ﴾. واته: وه فه‌رمانیشیان پێ درابوو که ده‌بێت هه‌ر ته‌نها خوای گه‌وره به ته‌نیا بپه‌رستن و به‌س به‌ندایه‌تی و عیباده‌ت بۆ ئه‌و بکه‌ن، که جگه له خوای گه‌وره هیچ په‌رستراوێکی تر نییه به هه‌ق، وه خوای گه‌وره له‌و شتانه پاك و به‌ریئه که موشریکان ده‌یکه‌نه پاڵی، یان پاکی و بێگه‌ردی بۆ خوای گه‌وره له‌وه‌ی که موشریکان ده‌یکه‌نه خوای خۆیان له ئه‌حباره‌کان و روهبانه‌کان)).

وه هه‌روه‌ها خوای گه‌وره له‌باره‌ی ئه‌وانه‌ی که هاوشێوه‌ی شوێن که‌وته‌ی ئه‌حبار و روهبانه‌کانن، و گوێڕایه‌ڵی و شوێن که‌وته‌ی غه‌یری شه‌ریعه‌ت و حوکمی خوای گه‌وره ده‌که‌ن، ده‌فه‌رموێت: ﴿ **أم لَهُم شُرَكاءٌ شَرَعوا لَهُم مِنَ الدين ما لَم يَأذَن بِهِ الله**

---

ئیمامی ترمذی وبه‌یهه‌قی و ئیبن شه‌یبه و طه‌به‌ری له عه‌دی یه‌وه ڕیوایه‌ت یان کردووه که: عه‌دی کوری حاته‌م خوای لێ ڕازی بێت ده‌گێڕێته‌وه جارێکیان خاچێك (صه‌لیب)ێکی ئاڵتونم له ملدا بوو، پاشان چومه خزمه‌ت پێغه‌مبه‌ری خوا (صلى الله عليه وسلم) که منی بینی فه‌رمووی: ئه‌مه چییه عه‌دی؟ ئه‌و بته فڕێده له ملتا، پاشان گوێم لێ بوو که ئه‌م ئایه‌ته‌ی ده‌خوێنده‌وه: (( **اتخذوا أحبارهم ورهبانهم أربابا من دون الله والمسيح ابن مريم** )). پاشان فه‌رمووی: ((أما إنهم لم يكونوا يعبدونهم ولكنهم كانوا إذا أحلوا لهم شيئا استحلوه وإذا حرموا عليهم شيئا حرموه)) خۆ ئه‌وان نه‌یان ده‌په‌رستن به‌ڵام ئه‌گه‌ر شتێکیان بۆ حه‌لاڵ بکردنایه حه‌لاڵ یان ده‌کرد و ئه‌گه‌ر شتێك یان بۆ حه‌رام بکردنایه حه‌رامیان ده‌کرد/هه‌روه‌ها مه‌عانی ده‌ڵێت: ئه‌حبار و روهبانه‌کانیان کردبووه خوای خۆیان به‌و جۆره‌ی گوێڕایه‌ڵی یان ده‌کردن له هه‌موو شتێکدا، هه‌روه‌ها عبدالله ی کوری موباره‌ك ده‌فه‌رموێت: ((وهل أفسد الدين إلا الملوك وأحبار سوء ورهبانه )).‏/ وه پرسیاریان کرد له حوزه‌یفه ئایا یه‌هود و نه‌صارا ئه‌حبار و روهبانه‌کانیان ده‌په‌رست؟ فه‌رمووی: نه‌خێر حه‌رامیان بۆ حه‌لال کردن و ئه‌وانیش حه‌ڵاڵیان کرد، وه حه‌لال یان بۆ حه‌رام کردن و ئه‌وانیش حه‌رامیان کرد ....).

**وَلَولا كَلِمَةُ الفَصلِ لَقُضِيَ بَينَهُم وَإنَ الظالمينَ لَهُم عَذابٌ أليم** ﴾ الشورى ٢١) واتـه: ئايا بۆ ئەو بێ باوەڕانە (موشریکانە) خوایەك هەیە، كە شەریعەت و حوكمێك یان بۆ دادەنێن لە ئایندا كە خوای گەورە هەرگیز ڕێی پێ نەداون (واتە بە ئەبو جەهل و شوێن كەوتوەكانی)، خۆ ئەگەر خوا ویستی بە دواخستنی عەزابیان نەبوایە، هەر لـەم دونیـادا بە هیلاکی دەبردن و سزای خۆی بەسەریاندا دەباراند، وە ستەم كاران (ئەبو جەهل و هاو ڕێگاكانی) سزایەكی سەخت و بە ئێش یان بۆ هەیە لە ڕۆژی دواییدا )) ...

چاك ئاگاداربە چاك ئاگاداربە ... خوا ڕەحم بەمن و تۆش بكات، لەبەر ئەوە زۆرێك لە خەڵكی ئەم سەردەمە بەم هۆیەوە تیاچون و بەهەلاكدا چوون...[٢٩]

## صفات العبادة الصحيحة :

## جۆرەكانی بەندایەتی ڕاست و دروست:

بۆ ئەوەی ئەو بەندایەتی و پەرستشەی كە دەیكەین، لەسەر ئەو شێوازە بێت كە خوای گەورە لێمان داوا دەكات و، پێی ڕازییە، پێویستە ئەم (٣) مەرجەی تێدا بێت:

- **(الحب)** خۆشەویستی.
- **(الخوف)** ترس.
- **(الرجاء)** ئومێد و هیوا .

- **(الحب)** : خوای گەورە دەپەرستین و بەندایەتی بۆ دەكەین لەسەر بنەمای خۆشەویستی بۆی، چونكە خوای گەورە سەنای ئەو بەندانەی كردووە كە بەو جۆرە دەیپەرستن و بەندایەتی بۆ دەكەن و، دەفەرموێت: ﴿ **والَذين آمنوا أشَدُ**

٢٩ ) ئەم حوكمە دەچەسپێت بەسەر حوكام و كاربەدەستە مورتەد و هەڵگەڕاوەكانی ئەم زەمانەدا، كە پێیان وایە موسوڵمانن و بانگەوازی ئیسلامەتی دەكەن، و حوكم بە قانون (قەوانین)ەكانی یەهود و نەصارا دەكەن (بەناوی دیموكراسیەت و چی و چی)، بائەوانیش بزانن كە بەهەمان جۆر موشریكن، خۆ ئەگەر خۆیان بانگەوازی بۆ نەكەن، ئەوەی خوای گەورە حەرامی كردووە حەلالی دەكەن، ئەوەی حەرامی كردووە حەلالی دەكەن، چونكە بەس بە تەنها گوێڕایەڵی و موالاتیان بۆ یەهود و نەصارا لە تەحكیمی قانون (قەوانین)ەكانیان، ( كەلەسەر بنەمای حەلال كردنی حەرام و حەرام كردنی حەلاڵ بنیات نراوە)، لە جێگەی حوكم و قانونی خوای گەورە، بە شیركی گەورە دادەنرێت، (واتە بەندایەتی و پەرستش بۆ غەیری خوای گەورە و كەسانی تر)، ئەو موشریكە عەرەبانەی كە موجادەلە و دەمە دەمەی موسوڵمانانیان دەكرد لە یەك حوكم لە ئەحكامەكانی ئیسلام، ئەویش بریتیی بوو لە حوكمی سەر بڕین (الذبح)، خوای گەورە گوێڕایەڵی و ڕازی بوون و شوێن كەوتنیان بۆ ئەو كەسانە كردە شیرك، ئەی چی بەوانەی كە شوێن یەهود و نەصارا دەكەون و گوێڕایەڵی و ئیطاعەی تەواوی حوكم و ئەحكام و قەوانینەكانیان دەكەن، وە تەواوی ئەحكامەكانی خوای گەورەیان وەلا ناوە و پشت گوێیان خستووە ؟؟

حُباً للهِ ﴾ البقره ١٦٥) واتە: ئەو کەسانەی کە ئیمانیان هێناوە، خوایان لە هەموو شتێك زیاتر خۆش دەوێت)).

- **(الخوف):** هەروەها بەندایەتی خوای گەورە دەکەین لەسەر بنەمای ترس و خەوف لێی و لە سزا و عەزابی، چونکە خوای گەورە دەفەرمووێت: ﴿**فَلا تَخافوهم وخافونِ إن كُنتم مؤمنين**﴾ آل عمران ١٧٥) واتە: ئەگەر ئێوە باوەڕتان بەهێزە، لەوان (بێ باوەڕان) مەترسن، لەخۆم بترسن)). هەروەها دەفەرمووێت: ﴿**يَدعون رَبَهُم خَوفاَ وَ طَمَعا**﴾ سجدە١٦) واتە: باوەڕ داران (موئمین)ەکان بەترس و بە ئومێدەوە بەندایەتی بۆ خوای گەورە دەکەن و لێی دەپاڕێنەوە )). واتە : ترسان لە سزاو عەزابی و ئومێدی مەغفیرەت و لێ خۆشبون و بەهەشت و پاداشتی خوای گەورە.
- **(الرجاء)** : وە هەروەها (الرجاء) ئومێد و هیوا، چونکە خوای گەورە دەفەرمووێت: ﴿ **وَيَرْجُونَ رَحْمَتَهُ وَيَخَافُونَ عَذَابَهُ إِنَّ عَذَابَ رَبِّكَ كَانَ مَحْذُورًا** ﴾ الاسراء ٥٧) واتە: باوەڕ داران بە ئومێدی رەحمەت و میهرەبانی پەروەردگارن، وە لە تۆڵە و سزاشی دەترسن، واتە لە نێوان هیوا و ترسدا بەندایەتی بۆ خوای گەورە دەکەن )).

بەڵێ، بەندایەتی خوای گەورە دەکەین بە خۆشەویستی بۆی و ترسان لە سزا و عەزابی و بە رەجائو هیواو ئومێدی رەحمەت و لێ خۆشبون و پاداشتی، هەموویان پێکەوە لەیەك كاتدا، ئەمە کار و حاڵی صالحین و پیاو چاکان و رەنج و تێکۆشانیان بووە، وە هەر ئەمەیە شێواز و سیفەتی بەندایەتی و پەرستشی راست و دروست، کە خوای گەورە لە بەندەکانی داوا دەکات و دەیەوێت، هەر بۆیە هەندێك لە پێشینان (سەلەف) دەڵێن: ((مَن عَبَدَ الله بالحب وحده فهو زنديق)) واتە: هەرکەس تەنها لەبەر حوب و خۆشەویستی بەندایەتی خوای گەورە بکات ئەوە زەندیقە ) .[30] /

---

٣٠ ) وەك هەندێك لە سۆفی یەکان (ئەهلی تەصەوف) بانگەوازی ئەوە دەکەن کە خۆشەویست و ئەحبابی خوان، تەنها لەبەر ئەوەی بە خۆشەویستی بۆ خوا بەندایەتی بۆ دەکەن، بەبێ ترسان لە سزاو عەزابی و رەجائو ئومێدی لێ خۆشبون و پاداشتی ، وە هەر ئەمەیە گەورەترین هۆکاری گومرایی و ضەلالەت و ئینحراف و لادانیان، چونکە ئەوان موخالەفە و پێچەوانەی فەرمانی خوای گەورەیان کردووە، لە کاتێکدا ئەو فەرمانمان پێ دەکات لەگەڵ خۆشەویستی دا ترس و ئومیدمان هەبێت پێی، وەك دەفەرمووێت: (( **وادعوه خوفا وطمعا** )).

هەروەها دەفەرموون: ((ومن عبده بالخوف وحده فهو حروری)) واتە: وە هەرکەس تەنها لەبەر خەوف و ترس بەندایەتی خوای گەورە بکات ئەوە حروری یە، واتە خەواریجە) .[٣١] / وە هەروەها دەفەرموون: ((ومن عبده بالرجاء و حده فهو مرجئ )) واتە: وە هەرکەس تەنها لەبەر (الرجاء) هیوا و ئومێد بەندایەتی بکات ئەوە مورجیئەیە) .[٣٢] / بەلاّم بەلاّم ئەهلی سوننەت و جەماعەت بە هەموو ئەم شتانە پێکەوە بەندایەتی خوای گەورە دەکەن.

## شروط قبول العبادة:

## مەرجەکانی دروستی و قبولّ بونی بەندایەتی:

هەروەها مەرجەکانی دروستی و پەسەندی بەندایەتی (٣) شتن:

- **(الایمان)** باوەری تەواوەتی.
- **(الاخلاص)** دڵسۆزی و نییەت پاکی.
- **(الاتباع)** لەسەر بنەمای ڕێباز و شوێن کەوتن بێت.

عیبادەت و بەندایەتی هیچ کەس دروست و پەسەند نابێت بەبێ هیچ کام لەم مەرجانە، واتە بە نەبوونی یەکێك یان بەندایەتی وەرناگیردرێت.

- **(الایمان):** هەر بەندایەتی یەك بەبێ (ئیمان) باوەرەوە بکرێت، ئەوە وەرنەگیراوە و مەردودە بەسەر بکەرەکەیدا، چونکە خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿**مَن عَمِلَ صالِحاً مِن ذَكَرٍ أو اُنثى وَهوَ مؤمن فَلَنُحيِيَنَهُ حياة طيبا**﴾ النحل ٩٧) واتە: هەر

---

ئەو گومرا و سەر لێ شێواوانە تێگەیشتو ترو زانا ترنین لە پێغەمبەران و پیاو چاکان، کە خوای گەورە وەسفیان دەدات بەوەی کە بەندایەتی دەکەن بۆی بە ترس و ئومێدەوە و، وەسف و سەنایان دەکات ...

٣١ ) الحرورية: \ دەگەڕێتەوە و دەدرێتە پال شاری حروراء، چونکە خەواریجەکان یەکەم شوێن بوو تێیدا دەرکەوتن.

٣٢ ) مورجیئە (المرجئة): ئەو تاقمە گومرا و سەر لێ شێواوەن، کە کردەوە (عەمەل) لە ئیمان جیادەکەنەوە، وەك دەڵێن: (یرجئون) واتە ئیمان دوا دەخەن و جیای دەکەنەوە لە کردەوە، و نایکەنە مەرجێك یان ڕوکنێك لە روکنەکانی ئیمان، وەك زۆرێك لە خەڵکی ئەم ڕۆژگارە ئەگەر بانگەواز بکرێن بۆ نوێژ کردن یان هەر یەکێك لە فەرائیزەکان، یەکسەر دەڵێن (إن الله غفور رحيم) بەبێ ئەوەی بێن بەدەم یەکێك لە فەرائیزەکان و جێبەجێیان بکەن .../ هەروەها وەك بانگ خوازانی (سەلەفی!) پێیان وایە ئەو حاکم و کاربەدەستەی حوکم بە قورئان نەکات ناتوانیت پێی بڵەیت کافر، چونکە هەر ئەمەلی هەیە ئیشەلاّ ڕۆژێك بیکات !!

کەسێك _نێر بێت یان مێ_ هەر کارێکی چاك بکات، بەئیمان و باوەرەوە، بەڵێن بێت بیژێنین بە ژیانێکی سەعادەت یان بیدەینێ لە قیامەتدا بەهەشت)). دەبینین خوای گەورە ئیمانی کردۆتە مەرجی وەرگرتن و پەسەندی بەندایەتی و کردەوە چاکەکان...

- **(الاخلاص):** دڵسۆزی و نییەت پاکی و یەکلایی تەواوەتی بۆ خوای گەورە: ئەمەیش وەك ئیمان بەبێ بوونی بەندایەتی (عیبادەت) وەرناگیردرێت، چونکە خوای گەورە لە فەرموودەیەکی قودسیدا دەفەرموێت: ((**أنا أغنى الشركاء عن الشرك من عمل عملا أشرك فيه معي غيري تركته وشركه وفي رواية فأنا منه بريء هو للذي عمله** )). رواه مسلم) واتە: من بەریم و بێ ویستم لەو کەسانەی کە هاوەڵەم بۆ دادەنێن (موشریکان)، هەرکەس هەر کردەوەیەك بکات و کەسێکی دیکەی تێدا بکاتە هاوەڵ و شەریکم، ئەوە کردەوەکە و شیرکەکە ئەدەمەوە بەڕوی خۆیدا، وە لە ڕیوایەتێکی تردا دەفەرموێت: ئەوە من بەریم لەو کردەوەیە، و بۆ ئەوکەسەیە کە لە پێناویدا و بۆ ئەوی ئەنجام داوە )). واتە من لێی وەرناگرم ./ خوای گەورە هیچ کار و کردەوەیەك وەرناگرێت هەتا خالیصەن تاك و تەنها لەبەر ڕەزامەندی ئەو نەبێت و لە پێناوی ئەودا نەبێت ..
- وە هەروەها **(الاتباع)** : خوای گەورە هیچ بەندایەتی یەك وەرناگرێت و پەسەندی ناکات هەتا لەسەر بنەمای شوێن کەوتنی قورئان وسوننەت نەبێت، واتە لەسەر ئیتباع بێت و صەوابی تێدابێت، و بەو جۆرە بێت کە خۆی لە شەریعەتدا بۆی داناوین، چونکە پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) دەفەرموێت: (( **مَن عَمِلَ عَمِلاً لَيسَ عَلَيهِ أمرُنا فَهُوَ رَدٌ**)). یان دەفەرموێت: (( **مَن أحدَثَ في أمرِنا هذا مَا لَيسَ مِنُه فَهُوَ رَدٌ**))[٣٣].واتە : هەر کەس کارێك بەزیاد بکات لەم دینەداو فەرمانی ئێمەی لەسەر نەبێت (قورئان و سوننەت) ئەوە دەدرێتەوە بەسەریداو لێی وەرناگیرێت)).[٣٤]

---

٣٣) متفق عليه : ئیمامی بوخاری و موسلیم ڕەحمەتی خوایان لێ بێت ریوایەتیان کردووە .

٣٤ ) جارێکیان پرسیاریان کرد لە (فضیل) ی کوری (عەیاض) لەبارەی ئایەتی ﴿**ليبلوكم أيكم أحسن عملا**﴾الملك٢).

پرسیان (أحسن) چاکترین کردەوە چییە ؟

هەر بۆیە (سەعیدی کوڕی جوبەیر) ڕەحمەتی خوای لێبێت هەمووکات دەیفەرموو: (( لا يقبل قول و عمل إلا بنية، ولا يقبل قول و عمل ونية إلا بموافقة السنة )). واتە: هیچ کات و کردار و گوفتار وەرناگیردرێت بەبێ نییەت، وە هەروەها کردار و گوفتار و نییەت وەرناگیردرێت، بەبێ موافەقەتی سوننەت)).

هەروەها تابیعی پایە بەرز (حەسەنی بەصری) بە ڕەحمەت بێت دەفەرموێت: (( لايصلح قول و عمل إلا بنية، ولا يصلح قول وعمل إلا بموافقة السنة )). واتە: کردار و گوفتار ڕاست نابێت بەبێ نییەت، وە کردارو گوفتاریش ئەگەر نییەتیشی لەگەڵدا بوو وەرناگیردرێت ئەگەر لەگەڵ سوننەتدا نە بێت)).

داوا دەکەین لە خوای گەورە کە تەوفیق من و ئێوەش بدات بۆ بەندایەتی و عیبادەتی ڕاست و صەحیح، وە کردەوەکانمان لێ قبوڵ بکات و ئاخیرەتمان بە خێر بگێڕێت .

برای موسوڵمان: بەژداربە لە بڵاو کردنەوەی ئەم کارە پڕخێرەدا، بە بڵاوکردنەوەی یان کۆپی کردنی، چونکە پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) دەفەرموێت: (( **الدالُ عَلى الخَيرِ كَفاعِلِه** )).

**وصلى الله وسلم على نبينا محمد وعلى آله وصحبه وسلم**

---

فەرمووی : (أخلصه و أصوبه)، واتە ئەوەیان کە لە هەموویان زیاتر ئیخلاصی تێدایە و لەسەر صەوابە .

وتیان : ئەی ئەبو عەلی (أخلص و أصوب) چییە؟

فەرمووی: (( إن العمل إذا كان خالصاً ولم يكن صوابا لم يقبل، وإذا كان صوابا ولم يكن خالصا لم يقبل، حتى يكونا خالصا و صوابا، والخالص أن يكون لله، والصواب: أن يكون على السنة )).

واتە : (( ئەگەر کردەوە تەنها بە ئیخلاص و دڵسۆزی یەوە بکرێت و لەسەر صەواب نەبێت، ئەوە وەرناگیرێت و پەسەند نییە، خۆ ئەگەر لەسەر صەواب بێت بەڵام دڵسۆزی و ئیخلاصی تیا نەبێت ئەویش بەهەمان جۆر هەر دروست نییە، وە (خالص) ئەوەیە کە تەنها لە پێناوی خوای گەورەدا بێت، وە (صەواب)یش ئەوەیە لەسەر سوننەت بێت )).